شناسنامه کتاب :

اسم کتاب : زمان و ئەدەب .
مؤلف : حسن‌صلاح (سۆران) .
ناشر : مؤلف
نوبت چاپ : اول .
تیراژ : ۱۰۰۰ جلد .
سال انتشار : تابستان ۱۳۶۸
چاپ و صحافی : چاپخانه جهان‌نما ـ تهران .

بسم الله الرحمن الرحيم

## سەرەتا

ئەم کتێبە کە بە ناوی (زمان وئەدەب ) بڵاودەبێتەوە ،بریەتیە لە باسگەلی جۆربە جۆر ، کە زۆرتریان دەکەونە نێو ئەم چوار چێوەی خوارەوە :

١ ـ باسی زماننا سی کوردی ، وەک ( وشەناسی) ، ( دەنگناسی) و (تەشکناسی).

٢ ـ باسی ئەدەبی زمانی کوردی ، وەک ( چۆن هۆنراوە بنووسین ؟).

٣ ـ لێکۆڵینەوەی ئەدەبی ، وەک (هۆنراوەی سوروشتی لە زمانی کوردیدا )و ( شێعری نوێ چیە ؟).

٤ ـ تەجرەبەی ژیان ، وەک ( وتەی کورت ) و ( هەڵکەوتو ).

هەروەک دەزانن، هرێک لەم باسانە وەک ( تەشکناسی ) تا ئێستا لەزمانی کوردیدا کاری زۆر لەسەر نەکراوە ، جا لەبەر ئەمە، ئەم نووسراوە کورتەی‌من لەم مەبەستەدا ناتوانێ شتێکی کامڵ بێ . هەر لەبەر ئەمە من هیوام ئەمەیە، کە نووسەران و قەڵە مبەدەستان،لەسەر ئەم بنەرەتە چکۆڵانەیە کە من لێرەدا لە بارەی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیەوە دامناوە ، کۆشکی گەورەی تەحقیق ساز بکەن و پەرە بەم زانستە زماننا سیانە بدەن ، وەک : وشەناسی، دەنگناسی ، وشە سازی .

مەبەستێکی دیکە کە لەم کتێبەدا سەرنجی تایبەتی دراوەتی، بریەتیە لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبی لە سەر مەبەستی ( وەرگێران )، (هۆنراوەی سوروشتی)، ( هۆنراوەی عیرفانی) و ( سەنعەتی جناس ) و (شێعری نوێ ). کە لەم رێبازەدا دوای لێکۆڵینەوە، نموونەم بۆهێناون . کە بە هیوام لە ناساندنی ئەم مەبەستانەدا بەکەڵک بێ .

حسن صلاح ( سۆران )

١٣٦٧

# وشه ناسی ( Etymology ) کوردی

هەروەک دەزانین ، لەم سەردەمە دا ، زانستی زمانناسی یەکێک لە زانستە گرنگەکانە و بە پەرەگرتنی پەیوەندی لە بەین نەتەوە جۆربەجۆرەکانی جیهاندا ، ئەم زانستە ڕۆژ بە ڕۆژ گەشە دەستێنێ . یەکێک لە لقەکانی زانستی زمانناسی ، زانستێکە بەناوی وشەناسی ( Etymology ) ، کە بۆ فێربوونی زمان گەلێک بەنرخە .

ئەم زانستە بریەتیە لە فۆڕموولێک ، کە وەک فۆڕموولی ڕیازی وایە ،بەڵام تۆفیری ئەمەیە ، کە ئەم فۆڕموولە ، فۆڕموولی فێربوونی زمانە ، لە پەیوەندی لەگەڵ مانالێکدانەوەی وشەکاندا ، بەڵام فۆڕموولی ڕیازی ڕێوشوێنێکە کە زانستی ڕیازی دەخاتە نێو چوارچێوەیەکی دیاریکراوەوە . یا دەتوانین زانستی وشەناسی ، بە زانستێک دابنێین ، کە بە هۆی ئەم زانستەوە دەتوانین وشەکان شی بکەینەوە ، هەروەک زانستی شی کردنەوەی شیمیایی ، کە بەهۆی ئەو زانستەوە دەتوانین مەوادی شیمیایی ئانالیز بکەین.جا لەبەرئەمە دەڵێین کەزانستی وشەناسی وەک زانستی ئانالیزی شیمیایی وایە ،بەڵام تۆفیری ئەمەیە کەبە زانستی وشەناسی وشەئانالیز دەکەین ، ئەمما بە زانستی ئانالیزی شیمیایی ماددە ئانالیز دەکەین . کاتێ کە بەهۆی ئەم زانستە ، وشەئانالیز بکەین ، دەتوانین بزانین کە وشەکان لە چی دروست بوون .

بەچەشنی گشتی، لە زانستی وشەناسیدا ، وشە لە سێ بەشی سەرەکی دەتوانێ پێک بێت ، بەم چەشنەی خوارەوە :

١ – پێشگر .
٢– ڕیشە .
٣– پاشگر .

بۆ نموونە ، لە وشەی " ناشیرین " دا ، " پێشگر "، "ڕیشە" و" پاشگر" ئەمانەن :
<u>نا – شیر – ین</u> ، کە بەشی "نا" پێشگرە ، بەشی " شیر" ڕیشەیە و بەشی " ین" پاشگرە .
ئێستا بە پێی ئەم فورموولە ، چەند وشەی کوردی ئانالیز دەکەین . سوودی ئەم زانستە ئەمەیە ، کە بە پێی ئەم فۆڕموولە دەتوانین مانای وشەکان بزانین و زۆر جاردەبێتە هۆی ئەمە کە بۆ پەیدا کردنی مانای وشەیەکی تازە پێویستمان بە کتێبی فەرهەنگ نەبێ. بە کورتی بڵێین ، ئەم زانستە فۆڕمووڵی پەیدا کردنی مانای وشەیە . بۆ فیربوونی زمانەکانی هەندەرانیش دەتوانین زانستی وشە ناسی ئەو زمانانە فێربین و کەڵکی لێوەرگرین .

جا ئێستا لە خوارەوە ، چەند نموونە لەم کارە نیشان دەدەین :

نموومەنەی شی کردنەوە (ئانالیز)ی وشەناسی

<u>١– ناشیرین :</u>

– " نا " ، کە پێشگرە و وشەکە خونسا دەکا .
– "شیر" ، کەڕیشەیە و واتە " شیر یاسپیایی".
– "ین " ، کەپاشگرە و وەشەکە دەکاتە نیسبی ، چون " ین " کەرەسەی نیسبەتە .

جا بەو چەشنەی سەرەوە وشەی " ناشیرین " واتە " نەک وەک شیر" و واتە" وەک شیر نیە" . هەروەک دەزانین ، یەکێ لەشتە شیرینەکان کە بەشەر بۆ جاری هەوەڵ چەشتویەتی ، شیری دایک بوە. لە بەر ئەمە ، بە شتی وەک شیری گوتوە" شیرین " ، واتە وەک شیر . لێرەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە ، کە " نا شیرین " واتە شتێک کە وەک شیر وانیە. یانی

## وشه ناسی ( Etymology ) کوردی

شتێک ، که شیرین نیه. واته شتێک که تاڵو ناشیرینه.

**٢- هاو سێ :**

- " هاو " ، که پێشگره و هاواڵ بۆ وشەکه پەیدا دەکا .
- " سێ" ، که ڕیشەیه و واته " سێبەر".

جا بەو چەشنەی سەرەوه وشەی " هاو سێ " واته " هاوسێبەر" ، یانی ماڵەکەیان هێنده به یەکەوه نیزیکه، که کاتێ تاو هەڵدێ، سێبەریان به تێکڕا دەکەوێته سەر زەوی ، واته ماڵه کەیان به یەکەوه نووساوه.

**٣ - سەنگین :**

- " سەنگ " ، که ڕیشەیه و واته " بەرد".
- " ین " ، که پاشگره و وشەکا دەکاته نیسبی، چون " ین " کەرەسەی نیسبەته.

جا بەو چەشنەی سەرەوه وشەی " سەنگین " واته " وەک بەرد. واته " قورس".

بە هۆی ئەم فۆرمووله بۆمان دەرکەوت ، کەبۆ کەڵک وەرگرتن لەم ڕێوشوێنه ،دەبێ ئەم کارانەی خوارەوه بکەین ، تا بتوانین کەرەسەی تەواومان بۆ ئەم ئانالیزه ببێ :

الف- وشەکه بنووسین .

ب - وشەکه بەش بەش کەین ، تا پێشگر، ڕێشه وپاشگر له یەک جوێ ببنەوه .

ج - مانای بەشەکانی جۆربەجۆر وەک پێشگر، ڕیشه و پاشگر لێکدەینەوه.

د - ماناکه بخەینه سەر یەک .

کەرەسەی پێویست بۆ ئەم کاره ئەوەیه کەبۆ زمانی دیاریکراو، کەلێرەدا زمانی کوردیه ، تاقمی پێشکر و پاشگر بناسین وله ڕیشەشدا زانستی گشتیمان ببێ . بۆ نموونه :

- بزانین پێشگری " نا " وشه خونسا دەکا ، یا پێشگری " هاو" هاواڵ یا شەریک پەیدا دەکا .
- بزانین پاشگری " ین " وشه نیسبەت دەدا بەشتێکەوه.
- بزانین ڕیشەی " شیر" واته" شیری حەیوان" یا " سەنگ " واته بەرد وسەنگی تەرازو.

بەم چەشنه ، واته بەهۆی ئەو فۆرموولەی سەرەوه و به فێربوونی ئەو کەرەسانەی که گوتمان ، دەتوانین لەزانستی وشەناسی کەڵک وەرگرین و مانای وشەکان بزانین و زۆر جار بەم فۆرمووله وشەی تازه دروست بکەین .

## هەڵکەوتوو

لە تەواوی جیهاندا ، زۆرتری خەڵکڕیانیان بە چە شنی ئاسایی ڕادەبورێ، واتە لە پاش لەدایک بوون ، تەمەنی سەردەمی منداڵی و مێردمنداڵیان تێ دەپەڕێ ،دەرس دەخوێنن یا کاروپیشە فێردەبن ، هاوسەر هەڵدەبژێرن ، دەبنە خاوەنی منداڵ ونەوە و نەتیجە و لە پاشان دەمرن . زۆرتری خەڵکی ئاسایی ، وەک ژیانیان ، بیر و فیکریان لە سەر تەوەرە و بستەیەک (٢) دەسوورێ ، واتە لە پاش ئەوەی کە خۆیان ناسی ، گرنگترین ئامانجیان ئەمەیە کە بە دوای پارە پەیداکردن دا بڕۆن و لە سەردەمی ژینیاندا ڕووداوێکی ئەوتۆ گرینگ رووناداد ، بێجگە لەمە کە کاتێ دەوڵەمەند دەبن ، کاتێ فەقیر و کاتێ شوغڵی چاکیان دەست دەکەوێ و کاتێ شوغڵی نزم.

بەڵام لە نێو تەواوی نەتەوەکاندا ، هێندێک مرۆوی هەڵکەوتوو پەیدا دەبن ،کە ژیانیان بە ئەو چەشنەی سەرەوە تێ ناپەڕێ . واتە ئەو شتە ئاساییانەی سەرەوە بۆ ئەو مرۆوە هەڵکەوتوانە کەرەسە ( وە سیلە) یە و ئامانجیان شتێکی ترە . چون مرۆوی هەڵکەو- توو تەواوی ئاواتی ئەوە نیە کە لە دایک ببێ و بمرێ بۆ ئەمەی، کە دەوڵەمەند ببێ یا شوغڵی باشی ببێ . بەڵکە ئامانجی بەرزتری هەیە و دەیەوێ ئەم ژیانە ئاساییە کە بە کورتی بریەتیە لە دایک بوون ، ڕابواردنی سەردەمی منداڵی و مێرد منداڵی، دەرس خوێندن، هاوسەر هەڵبژاردن ، خاوەنی منداڵ و نەوە و نەتیجەبوون و مردن ، لەخزمەت ئامانجێکی بەرزتردا بە کار بگرێ . مرۆوی هەڵکەوتوو بۆخۆی دەبێ بەدیهێنەری بڕێک لە سامانی زانست ، شارستانەتی ، فەرهەنگ و هونەری مرۆوایەتی بێ و بە پێچەوانەی مرۆوی ئاسایی کە فەقەت ئامانجی ئەوەیە کە کاربکا ، پارە دەربهێنێ و خەرجی بکا ، مرۆوی هەڵکەوتوو بۆخۆی سامانێکی واتایی پربایی ئامادە دەکا وبە کوێرەی دەستە چیلە (٣) پێشکەشی دەکا بە کوانوی زانیاری مرۆوایەتی ، تا هەم تینی کوانوی زانست دەوامی ببێ و هەم بە هۆی مەشعەلێک کە لەم کوانوە هەڵدەگیرسێ ، کوانوچکەی زانستی دیکەش بەدی بێ و ئەو ڕۆشناییە نەکوژێتەوە .

بێجگە لە پێغەمبەرانی خۆشەویست ، کە نێرراوی خوای گەورەن بۆ نێو خەڵک و باسی ئەو پایەبەرزانە لە چوارچێوەی ئەم وتارە چکۆڵەدا ناگونجێ ، بڕێک لە مرۆوە هەڵکەوتوەکان یەکێک لە ئەمانەی خوارەوەن :

- زانایان
- داهێنەران
- دۆزەرەوان .(٤)
- هۆنەران
- نووسەران
- وێنەگەران
- لێکۆڵەرەوان
- پەیکەرتاشان
- ئاهەنگسازان
- هونەرمەندان
- تەواوی ئەو کەسانەی کە ئیشی زانستی ، فەرهەنگی و هونەری دەکەن و لە ئەم بەستێنانەدا ، دەبنە مرۆوێکی هەڵکەوتوو .

## هەڵکەوتوو

دەبێ ئەمە بزانین کە مرۆوی هەڵکەوتوو ، بە بێ هۆ نابێتە هەڵکەوتوو، بەڵکە پتر ژیانێکی تایبەت دەبێتە هۆی ئەمە کە مرۆو ببێتە مرۆوێکی هەڵکەوتوو. دەنا کەسێک کە ژیانی ئاسایی ببێ ، خۆشی دەبێتە مرۆوێکی ئاسایی . بۆ ئەوەی کە هۆکانی هەڵکەوتوو بوون دیاری بکەین ، لە خوارەوە برێک لە ئەو شتانەی کە بە چەشنی بزوێنەر مرۆو دەکەنە هەڵکەوتوو، بە کورتی ناودەبەم:

ئەم کەسانە شایەد ببنە هەڵکەوتوو:

١ـ ئەو کەسانەی کە یەکێک لە ئەندامی لەشیان کەمە یا ناسازە، وەک: چاو ، دەست ، پا وشتی دیکە . بۆ نموونە دەتوانین ئەم سێ کەسەی خوارەوە ناو ببەین ، کە هەرسێکیان لە نیعمەتی بینایی بێبەش بوون :

- خوالێخۆشبو ئەحمەدی کۆر ، کە هۆنەری بە ناوبانگی چەرخی خۆی بوە.
- خوالێخۆشبو حەسەن جەزراوی ، گۆرانی بێژی بەناوبانگی سەدەی حازر.
- شامی کرماشانی ، کە هۆنەری هاوچەرخ بوو و ماوەیەک لەمەو پێش کۆچی دوایی کرد.

### هۆی ئەمە چیە؟:

کەسێک کە یەکێک لە ئەندامەکانی لەشی کەمە یا ناسازە، بۆ قەرەبووکردنەوی ئەو ئەندامە ، ئەندامە ساغەکانی بەهێزتر دەبن و لە بەر ئەمە دەتوانێ لە هێندێک بەستێندا ، سەرکەوتنی زیاتر بەدەست بهێنێ و ببێتە سەرکەوتوو و هەڵکەوتوو.

٢ ـ ئەو کەسانەی کە ژیانیان زۆر تاڵ و پر کوێرەوەری بوە، وەک: هۆنەری ئەم چەرخەی کورد، خوالێخۆشبو، مەلا مارفی کۆکەیی ، کە هەموو دەزانین چەند ئاتاجی و کوێرەوەری دیوە و نەداربوە.

### هۆی ئەمە چیە؟:

ئەو کەسەی کەژیانی تاڵە و کوێرەوەری و چەرمەسەرێ دەبینێ ، حاڵەتی سکاڵا وئاهوونالەی زۆر لێ پەیدا دەبێ و لە کۆمەڵ دەتەرێتەوە ، ولەبەر ئەمە دەیەوێ ئەو کەلێنە بە شتی دیکە پربکاتەوە و لە ئەم ڕێبازە دا ، دەتوانێ ببێتە مرۆوێکی هەڵکەوتوو.

٣ ـ ئەو کەسانەی کە ژنی زۆر دەمەوەریان هەیە . بۆ نموونە دەتوانین بە کتێبێکی ئینگلیزی ئیشارە بکەین ، کە لە ژێر سەردێری( پاکوتی ژنانی دەمەوەردا) نووسراوە . نووسەر لە ئەم کتێبەدا ، باسی زۆر کەسایەتی بە ناوبانگی کردوە کە گشتیان ژنی دەمەوەر و شیرەتیان بوە و کوتویەتی هۆی هەڵکەوتویی ئەو کەسانە ئەمەیە کە ژنی قەرەچەناغیان بوە.

### هۆی ئەمە چیە؟:

ژنی دەمەوەر و قەرەچەناغ دەبێتە هۆی ئەمە کە هەستی ئاسایی مێرد سەرکوت بکرێ و لە ئاکام دا ، مێردەکە هان دەدا بۆ ئەوە کە ئەم کەلێنە پر بکاتەوە. مێرد زۆر جار بۆ پرکردنەوەی ئەم کەلێنە، هێندە هەوڵ دەدا کە دەبێتە مرۆوێکی هەڵکەوتوو.

٤ ـ ئەو کەسانەی زۆر تەنیا بوون . وەک هۆنەری پایەبەرزی کورد خوالێخۆشبوو فایق بێکەس ، کە هێندە تەنیا بوە، لەبەر تەنیایی ناو خۆی ناوە ( بێکەس ) و نازناوی

## هەڵکەوتوو

هۆنەری بێکەس ی بۆ خۆی هەڵبژاردوە.

هۆی ئەمە چیە؟:

تەنیایی دەبێتە هۆی ئەمە، کە مرۆو پتر بیر لە دەور و بەری بکاتەوە و تێفکرینی ببێ. هەر ئەم بیر کردنەوە زۆرجار دەبێتە هۆی ئەمە کە مرۆو ببێتە ئینسانێکی هەڵکەوتوو.

٥ ـ ئەو کەسانەی کە عاشق بوون. وەک هۆنەری ڕاوێژ خۆشی کورد ئەحمد بەگی کۆماسی، کە گشتمان هۆنراوەی بە سۆزی ( گڵکۆی تازەی لەیل ) ی ئەومان بیستوە، کە لە مردنی ژنەکەیدا، کە عاشقی بوە نوسیویە. یا هۆنەری کەم وێنەی کورد خوالێخۆشبو نالی، کەگشتمان هۆنراوەی بەناوبانگی ( حەبیبە ) ی نالیمان بیستوە.

هۆی ئەمە چیە؟:

ئەوین دەبێتە هۆی ئەمە، کە مرۆو هەستیارتر بێ، هەر ئەم هەستیاریە زۆر جار دەبێتە هۆی هەڵکووتوویی.

٦ ـ ئەو کەسانەی کە باوکودایکیان هەڵکەوتوو بوون. وەک:

- شێرکۆ بێکەس، کە کوڕی خوالێخۆشبوو فایق بێکەس ە.
- ئالێکساندر دومای کوڕ. (٦)
- کاک محەممەد مەلا کەریم، کوڕی مەلا عەبدولکەریمی موددەڕیس.
- فاتیح عەبدولکەریم، کوڕی مەلا عەبدولکەریمی موددەڕیس.

هۆی ئەمە چیە؟:

کەسێک کە باوکودایکی هەڵکەوتوو بوە، خۆی بە شیاو و لێپرساوی ئەمە دەزانێ، کە خۆشی هەڵکەوتوو بێ، هەر ئەمە دەبێتە بزوێنەرێک (٧) بۆ ئەم کارە.

٧ ـ ئەو کەسانەی کە بە دوای ناوبانگدا دەگەڕێن. وەک:

- نیل[٨] ئارمسترۆنگ، هەوەڵ کەسێک کە چوە سەر مانگ.
- کاپیتان کووک، دەریانەوردی بە ناوبانگ. (٩)
- سیر[١٠] ئێدمۆند هیلێری، فاتیحی نوچکەی ئێوڕێست.
- ماژێلان[١١] دەریا نەوردی بە ناوبانگ.

هۆی ئەمە چیە؟:

کەسێک کە بە بنەوەشتی و بە گوڕ بە دوی ناوبانگدا دەگەڕێ، تێکۆشان و هەولی لە ئەم ڕێبازەدا، دەبێتە هۆی ئەمە کە بتوانێ مرۆوێکی هەڵکەوتوو بێ.

٨ ـ ئەو کەسانەی کە لە دوی پارەیەکی زۆر دەگەڕێن. وەک زۆر لە هونەرپیشەکان و ژنە بالەچیەکان، کە زۆر ناوبانگیان دەرکردوە.

هۆی ئەمە چیە؟:

کەسێک کە بە گوڕ بە شوێن پارەدا دەگەڕێ، هەوڵ و تەقەللاکەی لە ئەم ڕێبازەدا، زۆر جار دەبێتە هۆی ئەمەکە سەرکەوتنێکی مەزن بە دەست بهێنێ.

٩ ـ ئەو کەسانەی[١٢] ئاواتی هەرە بەرزیان هەیە. وەک:

- پاستۆر، دۆزەوەی میکرۆبی سیل.

## هەڵکەوتوو

- دوکتۆر کریستیان باڕنارد ( جەڕاحی دڵ ) . (١٣)
- ئێدیسۆن ( داهێنەری کارەبا ) . (١٤)

**هۆی ئەمە چیە ؟:**

ئاوات بۆ خۆی بەردی بنچینەی سەرکەوتنە. بەزمانی فارسی دەڵێن ( جویەندە یابەندە ئەست ) (١٥).

١٠ – ئەو کەسانەی کە سەربزێو (١٦) و کونجاون . وەک :

- پاپێن (١٧) ، کە بە دیتنی ئەمە ، کە کەشفی سەر مەنجەڵەکە لە حاڵەتی کوڵاندا دەلەریەوە ، کەوتە سەرەتەقێ و مۆتۆڕی بوخاری هەر لە سەر ئەم ئەزموونە داهێنا . کە ئەم کارە بە هۆی سەربزێوی و کونجکاوی بەدیهاتوە .

**هۆی ئەمە چیە ؟:**

سەربزێوی و کونجاوی دەبێتە هۆی ئەمە کە مرۆو بە شوێن شتدا بچێ وبچێتە بناوانەکەی و سەری لێ دەربێنێ کە چۆنەو چیە ، جا هەر ئەمە دەبێتە هۆی سەرکەوتن و هەڵکەوتن .

١١ – ئەو کەسانەی کە لەدەرس خوێندنی ئاسایی‌دا زۆر سەرنەکەوتوون.

بە گوێرەی ئامارێکی سەرەتایی کە بیگرین ، زۆرتری ئەو هونەرپیشانە ، کە زۆرمەشهوربوون ئەوانەن کە دەرسی کلاسیکی ( ئاکادیمێکی ) ئەووتۆیان نەخوێندوە یا خودی موختەریعین پتر لەو کەسانە بوون ، کە لە قوتابخانە زۆر سەرکەوتوو نەبوون و بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنە دەستیان داوەتە تاقە کارێک و تێی دا سەرکەوتوو بوون .

١٢– ئەو کەسانەی کە هەستێکی زۆر ناسکیان هەیە .وەک خوالێخۆشبو کاک هێمن موکوریانی. کەبۆخۆم لەبیرمە لەساڵی ١٣٤٢ی کۆچی هەتاویدا ، بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ لەگەڵی بووم .هێندە هەستی ناسک بوو ، کە زۆر جار بەدەنگی بایا بەخوێندنی مەلەکان، هەستی دەبزوت و من لە ڕواڵەتی دا زۆر بە ڕوونی ئەم حاڵەتەم دەخوێندەوە .

**هۆی ئەمە چیە ؟:**

ئەو کەسانەی کە هەستیان زۆر ناسکە ، تیژترین چەکە بۆ ڕام کردنی غوولی سەرکەوتن و بۆ ئەمە کەببنە هەڵکەوتوو.

١٣ – ئەو کەسانەی زاتەن نابیغەن . وەک :

- ئەبوو عەلی سینا .
- ئەنشتێن . (١٨)
- دۆکتۆر هەشتروودی ( ڕیازی زانی هاوچەرخ ) .

**هۆی ئەمە چیە ؟:**

نبوغ بۆخۆی دایکی تەواوی سەرکەوتو هەڵکەوتەکانە . مرۆوی نابیغە ، هەر لە کاتێک ڕاکە خۆی دەناسێ، هەڵکەوتووە .

## فەرهەنگۆک

(١) هەڵکەوتوو – بەرجەستە . (٢) تەوەرە و بستە – ڕەوش . (٣) دەدستە چیلە-پوشێکە کە منداڵان دەیبەنە کن ئاورێکی هەڵیکرساو ، تا ئەوانیش سووختی تێخەن. (٤) دۆزەرەوە – کاشیف .
(٥) قەرچەناغ – دەمشڕ . (٦) ئالێکسا ندردومای کوڕ . Alexandre Dumas (le fils)
(٧) بزوێنەر – موحەرڕیک . (٨) نیل ئارمسترۆنگ . Neil Armstrong کەلە ١٩٣٠ دا ، لە شاری( ئۆهایۆ ) ، لە وڵاتەیەککگرتوەکانی ئامریکا لە دایک بوە ولە ١٩٦٩ زاینیی داچوە سەر مانگ . (٩) جەیمس کووک James Cook ، کەدەریانەوردیکی ئینگلیزی بوو و

## هەڵکەوتوو

(نیو زیلەند)ی دۆزیەوە. ئەم پیاوە بەناوبانگە لە ١٧٢٨ زایینی دالە دایک بوە ولە ساڵی ١٧٧٩ دا کۆچی دوایی کردوە. (١٠) سیر ئێدمۆندهیلێری Sir Edmund Hillary که لە ١٩١٩ زایینی دا لە دایک بوە و لە ١٩٥٣ دا نوچکەی کێوی ئێورێستی فەتح کرد. (١١)ماژێلان F. Magellan دەریانەوردی پورتەقاڵی، کە لە ١٤٨٠ لە دایک بوە ولە ١٥٢١ دا کۆچی دوایی کردوە. ئەم پیاوە هەوەڵین کەسێک بوە کە بە دەوری جیهاندا گەراوە و لە ساڵی ئاخری ژیانی دا لە وڵاتی فیلیپین دوژراوە. (١٢) لوی پاستۆر Louis Pasteur ، شیمی زان و بیۆلوژیستی فەڕانسەیی، کە لە ساڵی ١٨٢٢ دا لەشاری (دۆل) ، لە وڵاتی فەڕانسە لە دایک بوە ولە ١٨٩٥دا کۆچی دوایی کردوە . کەم کەس هەیە کە ناوی ئام زانا مەزنەی نەبیستبێ. (١٣) دۆکتۆر کریستیان باڕنارد، کە لە ١٩٢٢ دا لە شاری (کەیپ تاون) لە دایک بوە. هەوەڵ کەسێک بوو کە پەیوەندی قەلبی ئەنجام دا. (١٤) تۆماس ئێدیسۆن (١٩٣١ - ١٨٤٧) کە لە ساڵی ١٨٨٤ دا کارەبای داهێنا. (١٥) ئاوات- هومێد. (١٦)سەربزێو ماجەراجوو. (١٧) پاپێن Denis Papin ، داهێنەری فەڕانسەیی کە لە نێوان ساڵەکانی ١٧١٤ - ١٦٤٧دا ژیاوە و هێزی هەلمی دۆزیەوەتە . (١٨) ئەنشتێن Albert Einstein ، کە لە ساڵی ١٨٧٩دا لە شاری (ئولم) لە ئاڵمانی رۆژاوایی لە دایک بوە و لە ١٩٥٥دا کۆچی دوایی کردوە. ئەم زانایە لە ساڵی ١٩٢١ دا خەڵاتی نۆبێلی وەرگرت.

## سەرچاوەکان


١ - مێژوی ئەدەبی کورد، نووسراوی عەلائەددین سەججادی .

٢ - مەشاهیر کورد، نووسراوی بابا مەردوخ ڕووحانی

٣ - دایرە تولمەعاریفی لاڕووس، بە زمانی فەڕانسە .


**تێبینی :**

لەبەر ئەمە بەسەرهاتی ژیان و شتی دیکەم سەبارەت بە مرۆوە هەڵکەوتوە کانی خۆماڵی نەنووسی، کە زۆرتری خوێنەران لەم باسە ئاگادار بوون . بەڵام چون پێم وابوو کە سەبارەت بە مرۆوە هەڵکەوتووە لاوەکیەکان ئاگاداری پتر پێویستە، لەبەر ئەمە بە کورتی لە سەرەوە باسم کردن .

## دەنگناسی ( Phonetics ) زمانی کوردی

زانستی دەنگناسی زانستێکە ، کە لە دەنگی پیتەکان دەکۆڵێتەوە . زمانی کوردیش وەک تەواوی زمانەکانی دی ، دەکەوێتە چوارچێوەی تایبەتی ئەم زانستە . جا لەبەر ئەمە پێویستە ، کە زماننا سانی زمانی کوردی ، سەرنجی تایبەت بدەن بەم زانستە و لەم کەوشەنەدا ، دەست بکەن بەلێکۆڵینەوەیەکی بەربلاو ، تا بەم چەشنە کەلێنێک کە لەم بەستێنەدا هەیە ، پڕ بکرێتەوە .

ئێستا کە لە سەرەوە باسێکی کورتی سەرەتاییم سەبارەت بەزانستی دەنگناسی کرد ، دەمەوێ لە خوارەوە ، بەپێی ئەم زانستە ، لە دەنگناسی زمانی کوردی بدوێم .

لە زمانی کوردی " ستاندارد" دا ، کە ئەم زمانەیە وا ئەم نووسراوەی پێنووسراوە ، مەسەلەی دەنگناسی ئەم تایبەتیە سەرەکیانەی خوارەوەی هەیە :

١ــ وشەکان هەر چەشنێ دەنووسرێن هەر بەم چەشنە دەردەبڕرێن ( تەلەفوز دەکرێن) .

٢ــ سەرکێش و ژێرکێش ، کە بەشکڵی "٧" دەنووسرێ و لە زمانی فەرانسەدا ، پێـی دەڵێن ( Accent ) ، نە خشێکی گرنگ کا یە دەکا .

٣ ــ دەنگی تێکەڵ ( Diphthong ) ، وەبەرچاو دەکەوێ .

بە لەبەرچاوگرتنی ئەو سێ خاڵەی سەرەوە ، لە خوارەوە مەبەستی دەنگناسی زمانی کوردی شی دەکەینەوە :

الف ــ هەروەک لەخاڵی (١) دا گوتمان ، لە زمانی کوردی دا ، پیتەکان و وشەکان هـەر لەونێک بنووسرێن هەر بەو لەونە دەردەبڕرێن و چون ئەو دەربڕینە بۆ ئەو کەسانەی کـە ئەلفوبێی عەرەبی دەزانن ئاشنایە ، بە پێویستم نەزانی کە سەبارەت بە جووڵانەوی دەم ، زمان ، شێویلکە و مەڵاشوو ، بۆ بەدیهێنانی دەنگی ئەم وشانە بدوێم ، چون بـۆ هـەموو کەسێک ڕوونە وهەر ئەو چەشنە دەردەبڕرێن ، کە لە زمانی فارسی وعەرەبی دا هەیە . بـەڵام ئەگەر لە جێگایەکدا جیاوازیەک ببێ دەیدرکێنم . دیارە ئەو کەسانەی کە ئەلفـوبێـی عەرەبی نازانن ، ناتوانن ئەم نووسراوە بخوێننەوە . لێرا دا دەبێ بڵێم کە بۆیە مـن بەم ئەلفوبێیە دەلیم ئەلفوبێی عەرەبی ، چون لەزانستی زماننا سی دا ( Linguistics ) ، ئەم ئەلفوبێیەکە ئێستا ئێمە کوردی پێدەنووسین ، بە ئەلفوبێی عەرەبی دەزانن ، چـون شکڵەکانی وێنەی ئەلفوبێی عەرەبیە . دیارە ئەلفوبێی دیکە لە جیهاندا زۆرن ، کـە بـۆ نموونە ئەلفوبێی لاتین ، عیبری ، یۆنانی و ژاپۆنی دەتوانین ناوبەرین .

ئەو پیتانەی کە وەک پیتی زمانی عەرەبی دەردەبڕرێن ، ئەمانەن :

ئ ــ ئامانج (١). ا ــ باش (٢) . ب ــ بارستایی . پ ــ پەلەوەر . ت ــ تەواو . ج ــ جـەردە . چ ــ چارشێو . ح ــ حەمتەلە . خ ــ خەبات . د ــ دابەزین . ر ــ گەردون (٣) . ز ــ زل . ژ ــ ژین . س ــ سەما . ش ــ شەکەت . ع ــ عاستەم . غ ــ غەمبار . ف ــ فیز . ق ــ قین . ک ــ (٤) کەو . گ ــ گەل . ل ــ لەوس . م ــ مەل . ن ــ نەبەز . و ــ ورد . هـ ــ هەنیسک . ە ــ بـزە . ی ــ یەک . ( هەروەک دەزانین پیتی (پ)(چ)(ژ) و (گ) لەزمانی عەرەبیدانیەبەڵام شکڵـی عەرەبییە ) .

تێبینـــی :

١ــ پیتی (ئ) ، پیتێکی بێدەنگ ( Consonant ) ە ، و بەهۆی بەستنی قـوڕوی ــ خوارو و کردونەوەی دەم ، دەنگی ئەم پیتە دروست دەبێ. بۆ نموونە ، لەم وشانەدا : ئاسـن ، ئۆردوو ، ئەرک ، ئینتیشارات . هەر وەک دەزانین ، ئەم پیتە لەو وشانەدا کە وشـەی

کوردین ، گشت کاتێ لە هەوەڵی وشەدا دێ .

٢- پیتی (ا) ، پیتێکی دەنگدار ( Vowel )ە،و گشت کاتێ یا لە نێوەڕاستی وشەدا دێ یا لە ئاخری وشەدا ، بۆ نموونە لەم وشانەدا : شار ، برا . بەهۆی کردنەوەی دەم و - کردنەوەی قوڕو و خاڵی کردنی بای سی ، دەنگی ئەم پیتە دروست دەبێ وەک پیتی (ا) ئەلفوبێی عەرەبی .

٣ - ئەگەر پیتی (ر) لە هەوەڵی وشە دا بێ ، گشت کاتێ دەنگی زل دەدا ، یانی دەبێ دوروشمی (٧) ی لە سەر بێ ، لەبەر ئەمە ، لە لیستی سەرەوە دا ، پیتی (ر) ی دەنگ چکۆڵەمان ناساند ، کەیالە نێوەڕاستی وەشەدا دێ یا لە ئاخری وشەدا .

٤ - پیتی(ە) ،کە پیتێکی دەنگدار ( Vowel )ە ،هیچکاتێک لەهەوەڵی وشەدا نایە ، یالە نێوەڕاستدا دێ یا لە ئاخردا ، وەک : بەرد ، بزە . دەنگی ئەم پیتە وەک دەنگی( فەتحە )یە لە ئەلفوبێی عەرەبی دا .

ب - سەرکێش و ژێرکێش :

لەخاڵی(٢) ی سەرەوەدا گوتمان، کە سەرکێش و ژێرکێش لە زمانی کوردیدا زۆر - گرنگە . هەروەک ڕامان گەیاند، سەرکێش و ژێرکێش لەم زمانەدا ، بەهۆی دوروشمی"٧" دیاری دەکرێ و لەگەڵ ئەم چوار پیتەی خوارەوە دا بەکاردەهێنرێ: (ر) ،(ل)،(و)و (ی) .

١- پیتی (ر) ، ئەگەر ژێرکێشی "٧" ی لە ژێر دابێ ، وەک (ڕ) ، ئیدی وەک (ر)ی فارسی دەرنابڕرێ ، بەڵکە زمان دەبێ بکێشرێتە دواوە وبە پانی بنرێ بە سەر مەڵاشوەوە و وەک (ڕ) لە وشەی ( کوڕ) داکە" منداڵی نێرینەیە" ، دەردەبڕرێ. بەم(ڕ) یە دەڵێن (ڕ) ی زل ، بەڵام بەم(ر) یە دەڵێن (ر)ی چکۆڵە .

٢- پیتی (ل) ، ئەگەر سەرکێشی"٧" ی لە سەر دابێ ، وەک (ڵ)، ئیدی وەک (ل)ی فارسی دەرنابڕرێ ، بەڵکە زمان دەبرێتە دواوە و نووکی زمان دەنرێتە سەر مەڵاشوو، وەک (ڵ)، لە وشەی (کەڵ ) دا ، کە " کامێشی نێرە" ، دەردەبڕرێ . بەم (ڵ)ە دەڵێن (ڵ)زل ، بەڵام بەم (ل)ە دەڵێن (ل)ی چکۆڵە .

٣ - پیتی (و) ئەگەر سەرکێشی "٧" ی لە سەردابێ ، وەک (ۆ) ،ئیدی وەک (و)ی فارسی دەرنابڕرێ، بەڵکە دەرگای دەم کۆدەکرێتەوە و وەک فیکەکردن دەری دەبڕین، وەک (ۆ)، لە وشەی (خۆر) دا ، کە" هەتاوە". بەم(ۆ) ە دەڵێن (ۆ)وی زل ، بەڵام بەم(و)وە دەڵێن (و) وی چکۆڵە .

٤- پیتی (ی) ئەگەر سەرکێشی"٧" ی لە سەردا بێ ، وەک (ێ) ، ئیدی وەک (ی)ی فارسی دەرنابڕرێ ، بەڵکە شێویلکەکان دەرەوێنەوە و پتر دەکرێنەوە ، وەک( ێ) لە وشەی( شێر)دا ، کە" پادشای جەنگەڵە". بەم (ێ)ی یە دەڵێن (ێ)ی زل ، بەڵام بەم(ی) یە دەڵێن(ی)ی چکۆڵە .

ج - دەنگی تێکەڵ :

دەنگی تێکەڵ ، بەمەدەڵێن کەدوو دانە پیت لە تەنیشت یەکتر قەرار بگرن و - دەنگێکی تایبەت بەدیبهێنن . وەک ئەم پیتانەی خوارەوە :

١- دوو پیتی "وی" وەک لە وشەگەلی(خوێ ، کوێ ،و دوێنی) دا ، کە دەنگی تێکەڵی ئەم دوو پیتە ، دەبێتە شتێک وەک دەنگی پیتی "Ö"ی زمانی ئاڵمانی، لە وشەی( Schön ) دا ، کە واتە جوان . بۆ دەربڕینی ئەم پیتە ، لێومان بەچەشنی دەربڕینی(و) دەردەهێنین، بەڵام بڕێک لێوی خوارەوەمان زیاتر دەنووسێنین بە پووکی خوارەوە .

٢ ـ دوو پیتی " ن گ " ، وەک لە وشەگەلی( هەنگە شەنگ ، وپەنگ) دا ، کە دەنگی تێکەڵی ئەم دوو پیتە ، دەبێتە دەربڕینی پیتی(گ) ، بە شێوەی نا زا ل ( Nasal )، کە بە زمانی فەرانسە واتە (کەپۆیی) یا نی لە لووت دا ، دەردەبڕێ . بەم چشنە هەوەڵ بەبێ ئەمە کە نووکی زمان لە بەشی پێشەوەی مەڵاشوو بدەین ، پیتی (ن) دەخەینە ناو لووت و بە دوای ئەودا پیتی (گ) دەردەبڕین . کە ئەم چەشنە دەنگە لە زمانی چینی دا ، زۆر هەیە .

٣ ـ دوو پیتی " ن ب" ، وەک وشەگەلی ( چەنبەر و عەنبەر ) ، کە دەنگی ئەو دوو وشەیە ، بە تێکرا دەبێتە ، دەنگی (م) . کە بەم لەونە ، ئەو دوو وشەی سەرەوە بە چەشنی ( چەمەر و عەمەر) دەردەبڕرێن .

٤ ـ دوو پیتی "وو" ، وەک ( لووت ، ڕووت و جووت )، کە ئەگەر ئەمدوو وشەیە بەیەکەوە بێن ، دەنگی (و) وی درێژ دەدەن .

٥ ـ ئەگەر دوو دانە پیتی بێدەنگ ( Consonant ) لە تەنیشت یەک قەرار بگرن ، لەنکەر دەکەوێتە سەر ئەو پیتە وەک " تەشدید"لە زمانی عەرەبی دا . وەک وشەگەلی( محەممە قەسساب و بەققاڵ ).

٦ ـ ئەگەر پیتی " ک ی" بە تەنیشت یەکەوە بن و " ک" بکەوێتە پێش "ی" ،وەک لە وشەگەلی( کێش ، کێو و کیسەڵ )دا ، دەنگی پیتی (ک) دەگۆڕڕێ و لە جێگەی ئەمە کە ئاخری زمان لە ئاخری مەڵاشووبدرێ ، نێوەڕاستی زمان لە نێوەڕاستی مەڵاشو دەدرێ .

٧ ـ ئەگەر پیتی " گ ن" بە تەنیشت یەکەوە بن و ( گ ) بکەوێتە پێش "ی" ،وەک لە وشەگەلی ( گێرە ، گیوە ، گێزەر) دا ، دەنگی پیتی ( گ ) دەگۆڕڕێ و لە جێگەی ئەمە کە ئاخری زمان لە ئاخری مەڵاشو بدرێ ، نێوەڕاستی زمان لە نێوەڕاستی مەڵاشو دەدرێ .

## سەرچاوەکان

١ـ کتێبی Webster ، بە زمانی ئینگلیزی ، بەشی فۆنێتیک .
٢ـ کتێبی Petit Larousse ، بە زمانی فەرانسە ، بەشی گرامار و فۆنێتیک .
٣ـ کتێبی Der Brckhaus ، بە زمانی ئاڵمانی، بەشی گرامار وفۆنێتیک .
٤ـ کتێبی " فۆنێتیکی زمانی کوردی" ، بە زمانی کوردی، نووسەر کاک محەممەد ئەمین هەورامانی ، کە لە ١٩٧٤ داچاپ بوە .

سۆران ١٣٦٧/٢/٢٧

## ڕێوشوێنی وەرگێڕان

وەرگێڕان بریەتیە لەمە، کە مەبەستێک لە زمانێکەوە وەرگێڕینە سەر زمانێکی دی. ئەم کارە بەم دوو چەشنەی خوارەوە ئەنجام دەدرێ:

١- وەرگێڕانی کەتبی لە نووسراوەیەک بۆ نووسراوەیەکی دی ( Translation ).

٢- وەرگێڕانی شەفاهی لە وتەیەک بۆ وتەیەکی دی ( Interpretation ).

ئێستا لە سەر بناغەی ٢٥ ساڵ تەجرەبەی وەرگێڕی کە لە زمانگەلی ئینگلیزی، فەڕانسە و ئالمانیدا هەمە، لەم نووسراوەیەدا، باسی ڕێوشوێنی وەرگێڕانتان بۆ دەکەم، کە لە خاڵی ژمارە (١) ی سەرەوە دا، ئیشارەی پێکراوە، تا لەم ڕێبازەدا ببێتە کەرەسەیەک بۆ ڕێنوێنی ئەو کەسانەی کە تازە دەستیان داوتە ئەرکی گرنگی وەرگێڕان، ئەم باسە بریەتیە لەم خاڵانەی خوارەوە:

١- مەرجی گشتی وەرگێڕ.

٢ - مەرجی گشتی وەرگێڕان.

٣ - مەرجی گشتی مەبەستێک کە لێی وەردەگێڕین.

٤ - مەرجی گشتی وەرگێڕراوە.

٥ - بەشگەلی وەرگێڕان.

٦ - نەخشی وەرگێڕ لە کۆمەڵ دا.

### ١- مەرجی گشتی وەرگێڕ:

وەرگێڕ دەبێ بەلای کەمەوە ئەم مەرجە سەرەکیانەی خوارەوەی ببێ:

الف- ئەو زمانەی کە پێی وەردەگێڕێ یەکجار باش بزانی.

ب- ئەو زمانەی کە لێی وەردەگێڕێ باش بزانی.

ج - تەشکی گشتی نووسینی باش بێ و بە وتەی مەشهورئەهلی قەلەم بێ.

د - لەو زانستەدا کە وەری دەگێڕێ زانستی گشتی کافی ببی.

ه - لەو مەبەستە کە وەری دەگێڕێ، تەواو حاڵی ببێ.

### ٢ - مەرجی گشتی وەرگێڕان:

وەرگێڕان دەبێ بەلای کەمەوە ئەم مەرجە سەرەکیانەی خوارەوەی ببێ:

الف- هەستی لێپرسراوی تێدا بکرێ.

ب- بە چەشنێ وەرگێڕرابێ کە خوێنەر لە کاتی خوێندنەوەدا، عەینی هەستێکی لێپەیدا ببێ، کە خوێنەری زمانێک کە لێی وەرگێڕراوە، لێی پەیدا دەبوو، واتە نابێ وشەبەوشە یا وتەبەوتە وەری گێڕین، بەڵکە دەبێ مانای وەرگێڕین.

ج - ڕاست و ڕەوان وەرگێڕرابێ و خوێنەر بتوانێ بە ئاسانی بیخوێنێتەوە.

د - تا بتوانین لە بە کارهێنانی وشەی ئەو زمانەی لێی وەردەگێڕین خۆبپارێزین، چونکە تا وشەی بێگانەی کەمتر تێدابێ، بەڵگەی ئەمەیە کە باشتر وەرگێڕراوە. بەڵام ئەمەش ڕوونە، کە لە هێندێک جێی تایبەتدا شایەد، کە زمانێک کە پێی وەر-دەگێڕین، وشەی تایبەتی بۆ بڕێک لە وشەکان نەبێ، لەم هەلومەرجەدا، دەتوانین مانایەکی بۆ بدۆزینەوە و بینووسین و هەر لەم کاتەشدا، وشەکە بە زمانێک کە لێی وەرگێڕراوە لە پارانتێزدا بنووسین.

۳- مەرجی گشتی مەبەستێک کە لێی وەردەگێڕین :

ئەو مەبەستەی کە لێی وەردەگێڕین، دەبێ بەلای کەمەوە ،ئەم مەرجە سەرەکیانەی خوارەوەی ببێ:

الف ـ مەبەستێکی بەڕێوجێ بێ .

ب ـ ئەو کەسەی کە نوسیویەتی ، دەستەڵاتی کافی لە زمانی مەبەستی نووسراوەکەدا ببێ .

د ـ ئەو کەسەی کە نوسیویەتی ، دەستەڵاتی سەرەتایی لە زانستی مەبەستی نووسراوەکەدا ببێ .

۴ - مەرجی گشتی وەرگێڕاو :

ئەو مەبەستەی کە وەرگێڕراوە، دەبێ ، بەلایکەمەوە ئەم مەرجە سەرەکیانەی خوارەوەی ببێ :

الف ـ بەڕێوجێ بێ .

ب ـ ئەو کەسەی کە وەریگێڕاوە ، دەستەڵاتی یەکجار باشی لە زمانی پێوەرگێڕراودا ببێ .

د ـ ئەو کەسەی کە وەریگێڕاوە ، دەستەڵاتی سەرەتایی لە زانستی مەبەستەکەدا ببێ .

۵ - بەشگەلی وەرگێڕان :

وەرگێڕ دەتوانێ بەلای کەمەوە ئەم مەبەستانەی خوارەوە وەرگێڕێ:

الف ـ کتێب

ب ـ فیلم ( شانۆ) .

ج ـ چیرۆک.

د ـ مەبەستی کاری و تیجارەتی ( قەرارداد ، نامە، سەنەد وشتی دی).

هـ ـ بەستە و گۆرانی.

و ـ بەردنووس ( کەتیبە ).

ز ـ پیستی ئاسک ( Parchement ).

ح ـ هەر شتێکی دی کە بە زمانێک نووسرابێ .

۶ - نەخشی وەرگێڕ لە کۆمەڵدا :

وەرگێڕێکی لێپرسراو ، بەلای کەمەوە ئەو نەخشە گرنگانەی خوارەوەی لە نێو کۆمەڵدا هەیە :

الف ـ قەڵەمی ئەو یا مێشکی دەبێتە پردێک لە بەینی مێشکی دوو نەتەوەدا ، کە لە زمانی یەکێکیان بۆ زمانی ئەوی دی وەردەگێڕێ . دیارە وەرگێڕ تا زمانگەلی زۆرتر بزانێ ، نەخشی لە کۆمەڵدا گرنگترە .

ب ـ وەرگێڕ دەتوانێ لە پەرەپێدانی زانست ، فەرهەنگ ، ئەدەب و تەواوی زانیاریەکاندا ، نەخشی سەرەکی بگێڕێ . بۆ نموونە ئەگەر زمانی ئاڵمانی وزمانی کوردی بزانێ، دەتوانێ زانستی خۆرسکی ئەستێرەکان واتە ( Astrophysics ) ، کە لە زمانی ئاڵمانیدا ، زۆری کار لە سەر کراوە ، بەو کەسانەی کوردی دەزانن و ئاڵمانی نازانن بناسێنێ

## ڕێوشوێنی وەرگێڕان

و دەستکردی بەرە چنین کە لە کوردیدا کاری زۆر لەسەرکراوە ، بەوانەی کە ئاڵمانــی دەزانن بەڵام کوردی نازانن بناسێنێ و بەم چەشنە ببێتە هۆی پەرەپێدانی ئەم کارانە.
وەرگێڕێ کە زمانگەلی کوردی و فەڕانسە دەزانێ ، دەتوانێ نووسراوەکانی گۆران بە خوێنەرانی فەڕانسە زمان بناسێنێ و نووسراوەکانی لامارتین بەکورد زمانەکان بناسێنێ.
وەرگێڕێ کە زمانی کوردی وزمانی ئینگلیزی دەزانێ ، دەتوانێ بەیتی جوانی کوردی، کە لە وێژەی جیهاندا کەم وێنەیە بە ئینگلیزی زمانان بناسێنێ و نووسراوەکانی شەیکسپیـر، بە کورد زمانان .

بە چەشنی گشتی ، وەرگێر دەتوانێ نەتەوەی خۆی بە هەندەران بناسێنێ و بە وەرگێڕانی مەبەستگەلی جۆربەجۆری زانستی ، فەرهەنگی ، ئەدەبی وشتی دی ، لە زمانگەلی هەندەران ، بۆ بووژانەوەی زانیاری نەتەوی خۆی هەنگاوی سەرەکی هەڵگرێ و بەم چەشنە مێشکی خۆی بکاتە پردێ لە نێوان نەتەوەکاندا، بۆ سەرکەتنو بەختیاری مرۆوایەتی.

## تۆفوبەند

بەیانی ڕۆژێکی نێوەڕاستمانگی زستان بوو ، ئەگەر تفتهەڵهاویشتایە دەیبەست ئاشەوانی مەزنی سوروشت لە کەوێژی خڕی ئاشی گەردوونەوە بەفرو کەرەسیەی دە بێـژا خوارەوە ، دەتگوت زستانی پیر لە داخی لەدەدستچونی سەردەمی دڵگەشێنی لاوی ، لە ئاسمانی تنۆکەوە فرمێسکی بەفرین دەڕژێنێ و هێندەی ئەسرینی سپی لە چاو هاتبوو، کە ڕدین و بەرپێی وەک چۆری شیر سپی ببو، هەر لەم کاتەشدا ، سوورشتە پیرە چاوی بەم ڕدێنە سپیەی خۆی دەکەوتو پتر کوڵی گریانی هەڵدەستا وسەری بە هەنیسکی بادەوەوە هەڵدەکەندرا و بربەندی باڕن وەها جیهانی سپیلکەی ڕێکوپێک و ساف و لووس کردبوو، کە هەتا چـاو هەتەری دەکرد دەوروبەری دێی " کێوە ڕەش " لە جێ خێڵی پەریان دەچوو.
ڕشەبای ملهوڕ خونکاری شەقام و داروغەی کۆڵانەکان بوو و بە هاژەی بێـوچـانی، پەیتاپەیتا زەنگی وسکوتی لێ دەدا و هەرکەس وەک ماستی مەیو گوێی بۆ شل نەکردایە، وەها بە قەمچی تیژی کزەی خۆی لەشی دارکاری دەکرد،کە پێستی ئەندامی وەک بیبار دەیسوڵاندەوە.
ئاشێکی ئاوی کۆن ، لەو بەر شیواوە خونچیلانەکەی تەنیشت ئاوایی بوو ، کە لە نێو تاریکی کرێوەو بۆراندا ، وەها نوقوم ببو کە دەتگوت چاوشارکێ دەکا. سەر دۆڵانـی ئاشەکە وەها بەستبوی ، کە چۆڕاوەی ئاوی دوێنێ نیوەڕۆ ، چەشنی شمشێر ونێزەی جۆربەجۆر، جەڕی دابو و لە دووڕا لە چەکی بلورین دەچوون . زەمورەک ، چەقەنە و تەوەرەی ئاشـەکـە ، گشتیان بە تورموزی سەهۆڵینی مامە شەختە ڕەق ڕاوەستابوون و بێجگە لە تینی بەتینی خوشکە هەتاو ، هیچ هێزێ نەیدەتوانی دەستوپێیان بکاتەوە کە ئەویش لە پشتی چارشێوی فای سپی هەورەوە ، بە شەرمەوە وەها خۆی شاردبووەوە ، کە هەستو خوستی نەبوو، دەتگوت بەهـار خوازبێنی کەریەتیی و خەڵکی دێی کێوە ڕەشی ناردوەتە کن سووشت ، کە لە جێژنی نەورۆزدا هەتاو شوی پێبکاو شایی بکەن .
چۆمە پەنگە جوانەکەی بەردەمی دێ،کە لە بەهاردا ، بە کوزەڵەی ساوا وپنگەی شەونوێن وەکو بووک دەڕازاوە و زۆر جار بە تەوسەوە پێیان دەگوت " چۆمە زێڕینە " ، وەهـای جەڕدابوو و خۆی شاردبووەوە ، کە هیچ کەس نەی دەزانی لە کوێیە. جاری واش بوو، دەمگوت لە ترسی تۆف و بەند، لە سەر تدختی خیزەلانی لە مێژینەی خۆی نوستوە ولێفەی ئەستـور و گەرمی سپی بەفری بەسەر خوی دا ، داوە و رووتەختی سەهۆڵیشی بەسەر کێشاوە. لە بیرمە کـە چەند جار کاک نەبەزی جیرانمان ، بە سواری ئەسپە ڕەش ، بە پرتاو بە سەریدا تێپـەڕی،

بەڵام هێندە لیفەکەی ئەستور بوو و ئەوەندە خەوی خۆش بوو، کە جووڵەی نەهات.

پەلەوەرەکان کەسیرە کەوتبون و لە ژێر قەمچی تۆفانی شەختەدا، جگە لە باڵ و پەڕی خۆیان، داڵدە و پەنایەکیان نەبوو، لە بەر ئەمە وەها خۆیان کۆکردەبوەوە و – پەنایان بە لەشی خۆیان بردبوو، کە گرژ ببون و دەتگوت چونەتە نێو زگی خۆیسانەوە. لەگەڵ ئەمەشدا، منداڵی قوشمەی دێی کێوەڕەش تەپکەی لێ دەنانەوە.

سۆران – زستانی ۱۳۴۲

## هۆنراوەی سوروشتی لەزمانی کوردیدا

هۆنراوەی سوروشتی بە چەشنە هۆنراوەیەک دەڵێین ، کە هۆنەر سەبارەت بە بەرجەوەند و چلۆنایەتی سوروشت دەیهونێتەوە . ئەم تاقمە هۆنراوەیە فەقەت لە زمانی کوردیدا نیە ، بەڵکە لە زۆرتری زمانەکانی دیکەدا هەیە و هەر نەتەوەیەک سەبارەت بە بەرجەوەند و چلۆنایەتی سوروشتی دەوروبەری خۆی هۆنراوەی هەیە . بۆ نموونە هۆنەرانی عەرەب ، سەبارەت بە سەحراو بیابان ،کە لە مەلبەندی ژیانیاندا زۆرە ، هۆنراوەی زۆریان نووسیوە ، لە لایەکی دیکەوە کاتێک ئەدەبی ئینگلیزی لە بارچاو دەگرین ، بریەتی لە هۆنراوەی سەبارەت بە مژ و باران ، چون وڵاتەکەیان زۆرتر تەم و مژ و بارانە . بە کورتی بڵێین ، هەر نەتەوەێک سەبارەت بە بەرجەوند و چلۆنایەتی سوروشتی وڵاتی خۆی هۆنراوەی نووسیوە . (١)

هۆنەرە کوردەکانیش لەم حاڵەتە کەل نین ، و هۆنراوەی زۆر جوانیان سەبارەت بە بەرجەوندی سوروشتی ناوچەی خۆیان نووسیوە . هەر لەم پەیوەندیەدا ، زۆر هۆنەر لە بارەی نەورۆز ، وەرزی بەهار ، وەرزی هاوین ، پایز ، زستان و وێنەی گشتی سوروشتی کوردەواریەوە هۆنراوەیان نووسیوە . بەڵام هەر وەک دەبینی ، ئەم چەشنە هۆنراوانە زۆرتری سەبارەت بە نەورۆز ، بەهار و سەرنجی گشتی دیمەنی کوردەواری نووسراوە و کەمتر سەبارەت بە هاوین ، پایز یا زستان هۆنراوەیان نووسیوە . کەمتر هۆنەریک هەیە ، کە شتێکی سەبارەت بە بەهار نەنووسیبێ ، بەڵام زۆر هۆنەر هەن کە سەبارەت بە هاوین یا پایز شتێکی تایبەتیان نەنووسیوە . دەلیلی ئەمەش دەبێ لەمەدا بزانین ، کە بەو چەشنەی بەهاری کوردەواری سەرنجڕاکێشە ، هاوین وانیە و پایز و زستان ئەگەر چی سەرنجڕاکێشن ، بەڵام وەک بەهارنین .

ئێستا لەخوارەوە چەند نموونە لەئەم چەشنە هۆنراوانە دەناسێنین ؛

### ١ـ سەبارەت بە نەورۆز :

هەروەک کوتمان سەبارەت بە نەورۆز زۆر هۆنراوە نووسراوە ، کە هۆنراوەی خوارەوە هی مەلا حەسەن قازی (شاهۆ) یە . شاهۆ لە ئەم هۆنراوەیەدا بەجوانی تابلۆیەکی لە نەورۆز ڕەسم کردوە :

نەورۆزە ، جەژنە ، شاخ و چیا و کێوو دەر
تارای سەوزی دابەسەردا ، سەوزی کردەبەر
رازایەوە بە ڕەنگی کوڵان ، نیشتمانی مە
بوژایەوە درخت و چرۆی جوانی کەوتە دەر
غونچە بە بای نەسیمی بەیان ، کەوتەپێکەنین
سۆسەن گەشاوە ،یاسەمنیش تاجی نایە سەر
لالەو بەنەوشە ، نەرگس و نەسرین و گوڵی زەمەق
هەریەک بە نەشئێکەوە وادیتە بەر نەزەر
شەوبۆ ، چنورو سوورەهەڵاڵەو کەما و لەو
تازە لە ژێر بەفرەوە سەریان دەهێتەدەر
نەغمەی حەزینی بولبولی شەیدا لە عەشقی گوڵ
تەئسیر دەکاتە ناو دڵی غەمبار و ناو جگەر
قاسپەی کەوو چریکەی تەیرو تیوری کێو
خۆشی ئەدەن هەموو بە دڵی ماتی پڕ کەدەر

### ٢- سەبارەت بە بەهار:

زۆرتری هۆنەرانی ئێمە سەبارەت بە بەهار، هۆنراوەیان هەیە . لە خوارەوە، - هۆنراوەی بەهاری نالی تان پێشکەش دەکەم.

بنوارە بەهارو فوتوحاتی گوڵشەنی — گوڵ زاری کردەوە لەدەمی ،غونچە پێکەنی
لەم پارچە لۆکە هەورە، بەقەد روی زەمین — بەم رایەڵە، قەدیفەی سەوزی عەجەب تەنی
بورجی درەختی سەوزو بوڵەندی وەک ئاسمان — پێوەی شکۆفە ،وەک نەجمن بە رەوشەنی
بەزمی هۆزارە، قەلفری ئەغیارە ،دەوری گوڵ — سۆفی برۆ، مەبە درک، تۆ لە ئێمە نی
هەردارە بەرگ و، هەرگوڵێ رەنگێ خەلاتییە — هەر جوودی نەوبەهارە کە عالەم دەکا غەنی
دیسان لە بگرەبەردەی گوڵچین و باغەوان — بولبول کەناری گرت، دڵی غونچە راچەنی
خاری سەوزو شینی لەبەر کردوە جەبەل — دامێنی وەردی سوورە ، کەدەستم بە دامەنی
وادی بوە بەوادی پر نوری توری نار — نەعلەین لەپێ فرێ بدە ، نالی بە ئێمەنی

### ٣- هاوین:

سەبارەت بە وەرزی هاوین هۆنراوە زۆر نە نووسراوە. لێرەدا چەند دێرێ لە هۆنراوەیەکی خۆمتان بۆ نموونە پێشکەش دەکەم، کە لە بارەی هاویندایە:(٢)

بە هاویندا، کە دونیا لە تەبا بوو — هەموو رسقێ فراوان و تەبا بوو
بلالووک و گێلاسی ئالوبوڵ بوو — ترێ و قەیسی و هەڵوچە زۆرو بوڵ بوو (٣)
جەزی خەرمان لە گەنم و گەنمە شامی — برشتی زۆر بە چەشنی میسرو شامی
لە گەردونا بەشەو ئەستێرە پاکی — زریوەی بوو بە رووناکی و بە پاکی
کە عەودە لێی دەدا شمشاڵی خاڵی — بە نەی نەقشی دەکرد تەرسیمی خاڵی
دەسەی کیژی شلەی بالا نەمامان — (لە تاوی وان لەبۆ عاشق نەمامان)
لەگەڵ گەنجان بەکوڵ غەرقی سەما بوون — لە جوانیدا وەکو رۆژی سەما (٤) بوون

### ٤ - پایز:

سەبارەت بە پایز هۆنراوە نووسراوە ، بەڵام نە بە ئەندازەی نەورۆز و بەهار. لە خوارەوە ، نموونەیێک لە هۆنراوەیێک پێشکەش دەکەم، کە چەند دێرێک لە یەکێک لە هۆنراوەکانی خۆمە:

لە پایزدا گەڵاریزی خەزان بوو — بەرەی زەردی گەڵا چەشنی خەزان بوو
هەرەو کیفەو گژەو لوورەی شەماڵی — بە راماڵەو کەزۆو گوندی دە ماڵی
گژەی با کەوتە نێو دارو دەواران — بە هێزی با گەڵا گور گور دەواران
لە کاتێکدا هەور گشتی پەڵەیدا — بەگور باری ، وەها باری پەڵەی دا
زوقم هات و تەواوی عەرزی داگرت — لە تاقی سەر زەخیرەی بەفری داگرت

### ٥ - زستان:

سەبارەت بە زستان هۆنراوە زۆرن ، بەڵام نەک بەقەت بەهار و نەورۆز. لە خوارەوە ، هۆنراوەی زستانی هۆنەری هاوچەرخ ، جەنابی ئاغای عەبباسی حە قیقی پێشکەش دەکەم:

دیسان بەفرانبار دایدا کرێوە — دیسان رێبەندان سوپای بەرێوە
شکستو بەستی خاتوزمهەریر — کەی کەم، ئێستەی کەم ، لە هۆزی فەقیر
بای توورەوبارن بە مۆن ومرچی — سمکۆڵی دەکەن لە غاری ورچی
بە زەبرو زەنگی نە پەل ما نەمەل — بە غوولی چەنگی کێ بێ و بڵێ لەل

بووزی گرێدار چەند سفت و سەختە — بەستی بە شەختە ، دەستی لە تەختە
دەشت و بەندەنی کردە بەستەڵەک — باسی کەولیە ، بۆ ڕێویو دەڵەک
چەقەڵ قۆڕەقۆڕ ، گورگ لوورە لوور — سمورەی برسی نوورە دێ لە دوور
هاوارهاوردێ ، کالاَن وەپێچن — دەستێ کاروانی کڕێوە پێچن
گۆمی تەبیعەت گێژاوی زۆرن — بەلاَم زستانان سەدنەوع وجۆرن
چەرخ دەسوڕی وەکوو دەبینی — لەبۆ من وتۆن تاڵی و شیرینی

<u>٦ – بەرجەوەندی گشتی :</u>

چون ناوچەی کوردەواری پڕیەتی لە بەرجەوندی جوان و دلڕفێن و کوێستانی وەک زاگڕۆس ، نووچکەی بەرزی چیای قەندیل ، چۆمی خوڕی وەک کەلۆێ و کەلی وەک کەلی خانی هەیە ، لەبەر ئەمە لە هۆنراوەی کوردیدا سەبارەت بە ئەم چەشنە بەرجەوەندانە ، هۆنراوە زۆر نووسراون ، کە بۆ نموونە چەند دێڕێک لە یەکێک لەهۆنراوەکانی خۆمتان لە خوارەوە پێشکەش دەکەم . ئەم هۆنراوە یە سەبارەت بە بەرجەوەندی ئاوایی ( ساروقامیش)ە،کەلە ناوچەی فەیزوڵلاَ بەگی بۆکانە :

قەنارەو قومریو سێرو لە سەر دارو لە بەر زەردن
سەرۆکی تیپی مۆسیقای کەل و شیو و تەپو هەردن
خەریکی وەسفی مەولوودە (٥) و قلیجقایە (٦) و کەماجاڕن (٧)
بویژی کانی وباغ و ملەو چۆم و پلە و بەردن
ڕوکاری چیمەن و قۆپی (٨) بەهارستانی شیرینن
هەوارگەی کوزەڵە و پنکەو مەنێ وبەیبون ونەسرینن
شەتاو و جۆگەلەوچۆمی تەنیشتی باغی ئاواتم (٩)
بەکەوسەر پەنگ و پاراو و پڕ وشەنگوڵ و ڕەنگینن
گەزیزەی پیر محەممەد (١٠) هەروەکوو پیرۆزە ڕەخشانن
کێلاخەو کەنگرو مەزرە ، دیاری شاهی مەردانن (١١)
چڕوشاخی قەرەتەکیە (١٢) ، کە هۆی ئیلهامی سۆرانن
پەرێزو بەندەنی تەرزی دەڵێی دیبای ئەلوانن

دەمەوێ لە پێش ئەمەدا کە بە باسەکە دوایی بهێنم ، بە هۆنەران ونووسەرانی لاو پێشنیار بکەم ، کە لە نووسینی خۆیاندا یەکێک لە ئەو سوژانە کە لە سەری دەنووسن ، سوژەی ( سوروشت و بەرجەوەندەکانی سوروشتی) بێ ، چون بە بیرواڕی من یەکێک لە جوانترین سوژەکانە ، کە قەت کۆن نابێ. پێویستە ئەمەش بدر کێنم کە من پێم وایە کە هۆی ئەمەی کە ئەدەبی زمانی فەرانسە ، لە جیهاندا زۆر پێشوازی لێکراوە ، ئەمەیە کە زۆر لە نووسەران ، سوژەی سوروشتیان بۆ نووسراوەکانی خۆیان هەڵبژاردوە و زۆر لە هۆنەرانیش هۆنراوەکانی خۆیان سەبارەت بە بەرجەوندەکانی سوروشت هۆنیوەتەوە .

سۆران

---

(١)کل – جوێ ، ئیستیسنا . (٢) تەبا – تەسەل ، تێر . (٣) بۆڵ – زۆر – ، فراوان . (٤)سەما – ئاسمان . (٥) مەولودە – کێوێکە . (٦) قلیجقایە – کێوێکە .(٧) کەماجاڕ – کێوێکە .(٨)قۆپی – پێدەشتێکە . (٩) باغی ئاوات – باغێکە .(١٠) پیرمحەممەد – کێوێکە .(١١) شاهی مەردان – کێوێکە .

## خوێندنەوەونووسینی کوردی

هەروەک دەزانین ، ئەلفوبێی هەر زمانێک کەرەسەی سەرەکی ئەو زمانەیە و تا پیتەکانی ئەو ئەلفوبێ یە بە ڕێوجێ تر بێ ، ئەو زمانە ڕێکوپێک ترە .چون زمان لە وشە پێک دێ و وشەش لە پیتی ئەلفوبێ دروست دەبێ . جا ، ئەگەر وایە ، ئەگەر زمان بە بناغەی دیوارێک دابنێین ، پیتی ئەلفوبێی ئەو زمانە ، وەک خشتی ئەو بناغەیە وایە .

ئێستا کە گرینگی ئەلفوبێ مان بۆدەرکەوت ، دەبێ هەوڵ بدەین کە ئەلفوبێ یەکی یەکگرتوو مان ببێ بۆ زاراوی سۆرانی و بادینی زمانی کوردی، چون ئەم ڕاستەقینەیە دەزانین ، کە لە حاڵی حازردا ، بۆ ئەم دوو زاراوەی زمانی کوردی، کەدوو زاراوی سەرەکین ، ئەلفوبێ یەکی یەکگرتوومان نیە و هەرکەس بەویستی خۆی، بە چەشنێک هەرکام لەم دوو زاراوە دەنووسێ ، کە لە ئاکامدا ناکۆکی وپشێونی لە زمان و ئەدەبی کوردیدا دێتە گۆڕێ ، بۆ نموونە :

١ـ هێندێک دوروشمی (٧) لەسەر پیتی (ر) دادەنین، وەک ( پڕشنگ ) .

٢ـ هێندێک دوروشمی (٧) لەژێر پیتی (ر) دادەنین، وەک ( پڕشنگ ) .

٣ ـ هێندیک پیتگەلی (ث)، (ذ) ، (ص)، (ض)، (ط)و (ظ) بەکارناهێنن . وەک (موسەللەس) ، (سەلیب ) و ( نازر ) .

٤ـ هێندێک پیتگەلی خاڵی ژمارە (٣) ی سەرەوە بەکاردەهێنن ، وەک ( موثەلەث)، ( صەلیب ) و ( ناظر ) .

٥ ـ هێندێک (و ) ی درێژ بەم چەشنە دەنووسن (وو )، وەک ( دوو ) .

٦ ـ هێندێک (و ) ی درێژ بەم چەشنە دەنووسن (و ) ، وەک ( دو ) .

٧ ـ هێندێک زاراوی سۆرانی بە چەند چەشنە ئەلفوبێ دەنووسن .

٨ ـ هێندێک زاراوی بادینی بە چەند چەشنە ئەلفوبێ دەنووسن .

٩ ـ زۆر ئاڵوزی تر ، کە ئەگەر باسی هەموویان بکەین ، لە چوارچێوەی ئەم نووسراوە کورتەدا ، جێگەیان نابێتەوە و گشتمان ئەمانە دەزانین .

بۆئەوەی کە ئەو ناکۆکیانەی سەرەوە لەنێوبچن و لە سەرلێشێواوی پتری زمان و ئەدەبی کوردی بەرگری بکەین ، پێویستە کە ئەلفوبێی یەکگرتووی کوردی پێک بهێنین، دیارە کە ئەم کارە کە من هەمیشە پێی دەڵێم ( ئاڵوگۆڕی بەلفوبێ) ، دەبێ حەتمەن ئەنجام بدرێ، چون شیاو نیە بەم چەشنەی کە ئێستا هەیە ، درێژەی پێبدرێ و هیچ زمانێکی جێگرتووی دونیا ئەم سەرلێشێواویەی تێدا نیە . جا ئەگەر وایە ، با هەرچی زووتر ئەم کارە بکەین و یەک ئەلفوبێی یەکگرتوو پێک بهێنین .

شایەد لێرەدا خوێنەری خۆشەویستی ئەم نووسراوەیە بڵێ ، عیلاجی ئەم کارە چیە ؟.
لە وەڵامدانەوە بەم پرسیارە دا ، ئەم پێشنیاوی خوارەوە پێشکەش دەکم لە ژێر سەردێڕی ( پرۆژەی ئەلفوبێی یەکگرتووی زمانی کوردی) دا ، کەبە .هیوام سەرنجی زماناسان بۆخۆی ڕاکێشی :

### پرۆژەی ئەلفوبێی یەکگرتووی زمانی کوردی

١ـ ئەلفوبێی کوردی (چ زاراوی سۆرانی و چ بادینی) بەم چەشنەی خوارەوەبێ، کە بە تێکڕا دەبنە (٣٩) پیت .

ئ ـ ا ـ ب ـ پ ـ ت ـ ث ـ ج ـ چ ـ ح ـ خ ـ د ـ ذ ـ ر ـ ڕ ـ ز ـ ژ ـ س ـ ش ـ ص ـ ض ـ ط ـ ظ
ع ـ غ ـ ف ـ ڤ ـ ق ـ ک ـ گ ـ ل ـ ڵ ـ م ـ ن ـ و ـ ۆ ـ هـ ـ ە ـ ی ـ ێ .

کەڵکی ئەم کارە چیە ؟:

الف ـ دەتوانین تەواوی وشە عەرەبی و فارسیەکان ، کە هاتونەتە نێو زمانی کوردیەوە ، بە ڕووناکی بنووسین ، دەنا بۆ نموونە ، چۆن دەتوانین بزانین کە وشەی (سەد) مەبەست لە (بەند)ە یا عددەدی(١٠٠) ، یا وشەی (سەلاح) مەبەست لە (صلاح)ە یا (سلاح) .دیارە دەبێ ئەمەش بزانین کە وشەی زمانی عەرەبی و فارسی و زمانەکانی دیکە لە نێو زمانی کوردی دا هەیە و ئەمە ڕاستەقینەیەکە و زمانی کوردیش وەک تەواوی زمانەکانی دیکە ، وشەی زمانی تری تێدایە و ئەمە بۆ گشت زمانێک هەیە .

ب ـ بە قەبووڵ کردنی پیتگەلی (ث) ، (ذ) ، (ص) ، (ض) ، (ط) و (ظ) لە زمانی کوردیدا کارێکی خراپمان نەکردوە ، چون ئەم پیتانە ، پیتی عەرەبین و ئەوانیش هەر وەک (ا) ، (ب) و ئەوانی دیکەن ، چون بە پێی قانوونی زمانناسی ، تەواوی پیتەکانی زمانی کوردی، پیتی ئەلفوبێی عەرەبین . حەتتا ، پیتگەلی( پ ) ، ( چ ) ، ( ژ ) و ( گ ) کە بە پیتی فارسی بەناوبانگن ، لە بارەی ( فۆنێتیکەوە= دەنگناسیەوە ) ، بە پیتی فارسی دەناسرێن ، دەنا لە بارەی ( فۆرمناسی) یەوە ، ئەمانیش هەر عەرەبین .

ج ـ چون ئەلفوبێ کە زۆرترە ، زمانەکە غەنی تر دەبێ .

٢ ـ لەم ئەلفوبێ یەدا ، حەرکات بە حروفە ، واتە :

الف ـ لە جێگەی فەتحە (ـَ) ، پیتی ( ە ) دادەنێن ، وەک ( سەر ) .

ب ـ لە جێگەی کەسرە (ـِ) ، پیتی ( ی ) دادەنێن ، وەک (کتێب) .

ج ـ لە جێگەی زەممە (ـُ) ، پیتی ( و ) دادەنێن ، وەک ( خۆر ) .

کەڵکی ئەم کارە چیە ؟:

ـ هەر وشەیەک بە هەر چەشنێک بنووسرێ ، هەر بەو چەشنە دەخوێنرێتەوە .

٣ـ لە ئەلفوبێی کوردیدا ، سەرکیشی ( ~ ) ، جێی سەرکێشی (٧) دەگرێت و ئیدی ژێرکێش بە کارناهێنین ، وەک ( کێڵگە ) ، ( شڕ و شڕۆڵ ) .

کەڵکی ئەم کارە چیە ؟:

الف ـ دەتوانین زمانی کوردی بە گشت مەکینەی ماشین نووسی و چاپخانەی ستانداردی جیهان چاپ بکەین و ئیدی شتێکمان بەشکڵی(٧) نیە ،کە بە هیچ دەستگایەکی چاپ ناخوا . لە حاڵێکدا تەواوی ئەو مەکینانە ، کە بۆ نوسین و چاپی فارسی و عەرەبی دروست کراون ، دوروشمی ( ~ ) یان هدیە و بۆ خۆی بە چەشنی مێکانیکی تەرازە و دەتوانین بە جوانی لە سەر هەر پیتێک داینێین .

ب ـ چون دوروشمی حەوت زۆرتر دەبێ بە دەست دابنرێ ، هەڵەی زۆر تێدا دەبێ ، ـ جاری وا هەیە لە بیر دەچێ ، جاری وا هەیە لارە ، جاری وا هەیە خوارە و شتی دی ، کە لە هونراوەی ( حەوت٧) دا ، کە پەیوەستی ئەم نووسراوەیە ، بە چەشنی ئەدەبی باسم کردوە .

دەبێ ئەمەش ڕوون کەمەوە ، کە لە زاراوی بادینی دا ، پیتگەلی ( پ )، ( چ)،( ک ) و (گ ) بە دوو لەون تەلەفوز دەکرێن ، بەڵام چون ئەو وشانەی کە وابن یەکجار زۆر کەمن بەپێویستی نازانم کە دوو چەشن تەلەفوز بۆئەمانەش دانێین . لە لایەکە تریشەوە،زاراوـ گەلی هەورامی ، کرماشانی و هی تر ، برێک تایبەتیان هەیە ، کە بۆ ئەوانیش پێویست نیە وشەی تایبەت دانێین .

لە ئاخری ئەم نووسراوەدا ، پێویستە لە تەواوی ئەو کەسانەی کە لە نەسلی پێش ئێمەدا ، لەسەر ئەلفوبێی یەککرتووی کوردی کاریان کردوە ، قەدرزانین بکەین و دەبێ ئەمە بزانین کە ئەو مرۆوە مەزنانە ، بە پێی کاتی خۆیان ئەو ئەلفوبێیەیان دروست کردوە کە ئێمە ئێستا پێی دەنووسین . بەڵام ، بۆ چەرخی ئێمە ئیدی ، بە پێی ئەو دەلیلانەی سەرەوە ئەو ئەلفوبێیەکامڵ نیە ، لەبەر ئەمە من پێشنیاری ئەم ئاڵوگۆڕەم دا .

* * * * * * * * *

پێویستە ئەمە بدرکێنم ، کە لەسەر ئەم بناغە تەجرەبیانەی خوارەوە ، ئەو بیرو ـ رایەی سەرەوەم دەربڕی :

١ـ بە چەند زمانی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژاوایی ئاشنام ، تەرجەمە دەکەم و دەنووسم .
٢ـ لە کەڵ ماشێن چاپکەلی جۆربەجۆر ئاشنام .
٣ـ لە کەڵ مێکانیزمی نووسینی مەکینەی نووسینی ( ماشین تحریر ) جۆربەجۆر ئاشنام .
٤ـ تا ئێستا چەندین کتێبم نووسیوە و وەرگێڕاوە .
٥ـ ماوەی یەک چوارەمی سەدەیە کە لە سەر ئەلفوبێی کوردی و زمانی کوردی ، تەحقیق دەکەم .

ئێستا لە خوارەوە ، بۆ نموونە هەم بە زاراوی سۆرانی و هەم بە زاراوی بادینی ، دوو نووسراوە دەنووسم ، کە یەکێکیان بە ئەلفوبێیەکە ، کە لە حاڵی حازردا پێی دەنووسین و ئەوی دیکە بە ئەلفوبێیەکە ، کە لە ئەم نووسراوەدا ، پێشنیارم کردوە :

## الف ـ زاراوی سۆرانی :

### ١ـ بە ئەلفوبێی مەعمولی ئێستا :

یەزدانی بەرزو بەهێزو بزان ، خەیاتی بەرگی تەمەنی تۆیە
سۆران هەم گەزو هەم مەقەس بووە ،کورتیودرێژی بەدستیخۆیە

### ٢ـ بە ئەلفوبێی پێشنیاری سەرەوە :

یەزدانی بەرزو بەهێزو بزان ، خەیاطی بەرگی تەمەنی تۆیە
سۆران هەم گەزو هەممەقەست بەوە ،کورتیودرێژی بەدستی خۆیە

## ب ـ زاراوی بادینی :

### ١ـ بە ئەلفوبێی مەعمولی ئێستا :

مومکنە کدی هەتنێ دا کو طەلەبحاصل بت
صەید و نێچیر کو نەهت ، تولەیێ صەیاد چکەت

### ٢ـ بە ئەلفوبێی پێشنیاری سەرەوە :

مومکنە کدی هەتنێ دا کو طەلەب حاصل بت
صەید ونێچیر کو نەهتە تولەیێ صەیاد چکەت

## چۆن هۆنراوە بنووسین ؟

چون مەبەستی نووسینی هۆنراوە، گشتکاتێ لە نێو تەواوی نەتەوەکانی جیهان دا، جێگەی سەرنج بووە، بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانەوێ هۆنراوە بنووسن، ئەم پرسیارە دێتە گۆڕێ کە " چۆن هۆنراوە بنووسین ؟"، کە بە تایبەت بۆ لاوان و ئەو کەسانەی، کە تازە دەستیان بەم ئیشە کردوە، وەڵامی ئەم پرسیارە زۆر گرنگە. یا ڕوونتر بڵێین ،ئەو کەسانەی کە تازە دەستیان بە دانانی هۆنراوە کردوە، دەیانەوێ ڕێوشوێنی ئەم هونەرە بزانن .

هەروەک دەزانین ، لە زمانگەلی جۆربەجۆر دا ، کتێبگەلی زۆر لە سەر ئەم باسە نووسراوە و ئەم باسە شێکراوەتەوە . بەڵام لێرە دا ، من دەمەوێ بە چەشنێکی زۆر کورت بە کەڵک وەرگرتن لە تەجرەبەی سی وسێ ساڵەی خۆم لە کاری نوسینی هۆنراوە دا ، شتێک بنووسم کە تایبەتی هۆنراوەی زمانی کوردیە . بە هیوای ئەمە، کە ئەم نوسراوەی من بتوانێ بە تایبەت بۆ هۆنەرانی لاو جێگەی سوودلێ وەرگرتن بێ ، و ببێتە هۆی ئەمە کە ببێ ئەوەی کە بۆ خۆیان وەک من و هی وەک من بە تەجرەبە وەڵامی ئەم پرسیارە بدۆزنەوە و کاتیان بە هەدەر بچێ ، لەم نوسراوەیە کەڵک وەرگرن ، وە دەبێ ئەمە بزانن، کە ئەو پێنووسە لاوە کە ئێستا لە دەست ئەوان دایە ، شایەد لە داهاتوودا ، خولقێنەری گرنگترین شوێنەواری وێژەیی بێ و خۆیان ببنە یەکێکی وەک قانع یا گۆران ، جا لەبەر ئەمە دەبێ لە ئێستا را ، هەستی لێپرساوی بکەن و ئەو ئیشە هونەریە کە دەیکەن، بەلەونێکی باش ودوروست بکرێ .

لە پاش ئەوە کە لە سەرەوە مەسەلەی ئامانجی " چۆن هۆنراوە بنووسین ؟" مان ــ ڕوون کردەوە، ئێستا دەمەوێ بە چەشنی بنەڕەتی و کورت لە سەر ئەم باسە بدوێین .

لە شی کردنەوەی ئەم باسە دا ، چەند خاڵی گرنگ هەیە، کە دەبێ لە بارەی ئەو خاڵانەوە بدوێین ، کە بە چەشنی خوارەوەن ،

١ـ مەرجی گشتی بۆ نووسینی هۆنراوە .
٢ـ کاتی شیاو بۆ نووسینی هۆنراوە .
٣ـ مەبەستی هۆنراوە .
٤ـ ڕێنووس و زاراوی هۆنراوە .
٥ ـ وەزن.
٦ ـ قافیە .
٧ ـ چوارچێوە.
٨ ـ هۆنراوەی باشکامەیە.
٩ ـ پەیامی هۆنراوە.

هەروەک دەزانین ، بۆ باشتر ڕوون بوونەوەی خاڵەکان ، دەبێ نمونەی هۆنراوە ناوبەرین . من لێرەدا چون دەمەوێ شتێکی تێکنیکی بنووسم، کە زۆرتر بە تەجرەبە بەدەستم هێناوە، لە بەر ئەمە ، نمونەی هۆنراوەکان ، لە هۆنراوەکانی خۆمن .

### ١ـ مەرجی گشتی بۆ نووسینی هۆنراوە :

بە بیروڕای من دەبێ کەسێ کە دەیەوێ هۆنراوە بنووسێ، ئەم مەرجانەی خوارەوەی ببێ :

ا ـ ئەو شتەی کە دەینووسێ ، دەبێ خۆی باوەری پێی بێ . چون دەڵێن هەرشتێ لە دڵەوە هەڵستی ، لە سەر دڵ دەنیشێ .

# چۆن هۆنراوە بنووسین؟

ب ـ لە پێش دا ، هۆنراوەی خەڵکی تری زۆر خوێندبێتەوە . چون ئەگەر هۆنراوەی ـ خەڵکی زۆر خویندبێتەوە ، بیری ئەدەبی بەرین تر دەبێ .

پ ـ لەگەڵ وەزن ، قافیە و تێکنیکی نوسینی ئەدەبیدا ئاشنا بێ. چون هۆنەری خۆی هونەر یا سەنعەتێکە و دەبێ بۆ ئەوەی کە شوێنەوارەکانی باش بنووسێ، ئەو تێکنیکە باش بزانێ .

ت ـ ئامانجی بەرز بێ . تا ئامانجی بەرزتر بێ ، شوێنەوارەکانی بەرز تر دەبن .

ج ـ زانستی گشتی چاک بێ . چون مەعلوماتی عومومی بۆ هۆنراوە ، وەک خشت و سیمێنتە بۆ ساختمان .

چ ـ هەستی ناسک بێ . چون ئەگەر هەستی ناسک نەبێ ناتوانێ ئیلهام وەرگرێ و کاتێ ئیلهام نەبوو ، هۆنراوە بێرۆحەو وەک وتارێکی ساکار وایە .

٢ـ کاتی شیاو بۆ نووسینی هۆنراوە :

دەبێ تا دەکرێ ، لەم کاتانەی خوارەوە دا هۆنراوە بنووسین :

ا ـ لە کاتێک دا کە ئامادەگی ڕۆحی و لەشی مان هەیە . چون ئەگەر مرۆڤ ڕۆحی یا لەشی ماندووبێ، ناتوانێ شتی جوان بخولقێنێ .

ب ـ باشترە لە کاتی شەودا ، لە پاش شام و لە پێش خەوتن دا ، هۆنراوە بنووسین ، تا بکرێ هەر ئەو شەوە ئەو هۆنراوەیە تەواو بکەین . چون ژیانی شەو پتر ڕوئیاییە و شوێنی ڕووداوەکانی ڕۆژ لە سەر مێشک و روح کاری کردوە ، مێشک ئامادەیە کە بە گوێرەی ئەسرینی ڕۆح ئەو شوێنەوارانە بکاتە هۆنراوە .

پ ـ دەبێ لەو کاتەدا ، هەستی هاتبێتە کوڵ و حاڵەتی " فوق العادە"ی ببێ، چون لە حاڵەتی عادی دا ، فەقەت دەکرێ شتی عادی بنوسین .

٣ـ مەبەستی هۆنراوە :

مەبەستی هۆنراوە دەبێ بەشێوەی سەردێر ، لە پێشدا بنووسرێ، دەبێ ئەم سەردێرە کورت ترین و بە ماناترین سەردێڕی مومکین بێ و لە نێو هەڵبەستەکەدا ، بگونجێنرێ، بۆ وێنە :

بیر

کاتێ بەتاڵە ڕاوێژ و تەک بیر (1)     تۆفیری نیە یەک بیر (2) و سەد بیر (3)

سۆران لە (4) بیری گێژاوەی ژین دا     نەجاتت دەدا پاپۆڕی تەک بیر (5)

دە توانین هۆنراوە لە بارەی ئەم مەبەستانەی خوارەوە بنووسین :

ا ـ مەبەستی ئاینی ، بۆ وێنە :

یەزدان

یەزدانی بەرز و بەهێز وبزان     خەیاتی بەرگی تەمەنی تۆیە

سۆران هەم" گەز وهەم مەقەست بەوە"     کورتی ودرێژی بەدەستی خۆیە

ب ـ هۆنراوەی مەبەستی ئەوینی ، بۆ وێنە :

کاڵە

شەمامەی باغی سەرسنگت خڕ و تورت و پڕ وکاڵە (6)

دوو چاوی مەست و پڕهەستت ، کەژاڵو نەرگسیو کاڵە (7)

لە سوێی عیشقت وەها وێڵم ، تەوە للای خاکی سۆرانم
ئەوەند ڕۆیم بە دوی تۆ دا ، دڕاندم قۆندرە[8] وکاڵە[9]

پ- مەبەستی فەلسەفی ، بۆ وێنە :

**تاو**[10]

شەپۆلی ژین وەکو هەوری بە تاوە دەمێ تاوە[11] ، دەمێ ڕووناکو تاوە[12]
دەمێ بۆرانە ، ڕێبەندانە سۆران دەمێ تاوە[13] هەموی تاوو[14] هەتاوە[15]

ت- هۆنراوەیەک کە مەبەستی ئەو باسی سوروشت بێ ، بۆ وێنە :

<u>زستان</u> ( بڕێ لە هۆنراوەکەیە )

ئەوا ئەمڕۆکە زستانە ، چلە گەورەی موکوریانە
لەداخی سپیەتی ڕیشی فەلەک چاوی لە گریانە
شەپۆلی بەفری بێوچان، لە کوێی بانو لە نێو کوچان
گەمی دەنگی وەها قوم کرد، کەلو ئاسۆ چەمەریانە[16]
وەنەوشەو لالەو مێکووک[17] ، کە نەخشا بوون بە وێنەی بووک
ئەوێستا ماتو شەمزاون ، سیپاڵی ڕەش لەبەریانە
کرێوەو بادەوە و بۆران ، سەقەت مەحشەر دەکەن سۆران
چیا وا کاڵو بەفرینە، دەڵێی جێخێڵی پەریانە.

ج - مەبەستی شین گێڕی، بۆ وێنە :

هەڵبەستی فرمێسکاوی( <u>بڕێ لە</u> هۆنراوەکەیە )

دەستم ئەنا دەستی ، تەلیسمی خەیاڵ دەمکوت عازیزم بوومبە کۆی زوخاڵ
بۆچی هیچ ناڵێی ئاواتی ژینم چاوت هەڵێنە ، بەڵکەی ئەوینم
بەلام هەرچیم کرد وەلامی نەدام جوابی بەیانو کەلامی نەدام
لەو سەعاتەوە من باڵم شکا شووشە کورێنیو جەماڵم شکا
بۆیە پێت دەڵێم بمنێرە سەرباڵ لای ئەو بێرێژم فرمێسکی چوارساڵ
بلێم "حەسەن"ی دەستپەروەردەی تۆ سۆرانی تۆیە، لەهەر عەرزێ بۆ

چ - مەبەستی نیشتمانی ، بۆ وێنە :

<u>نیشتمان</u>

وەرەخزمەتی نیشتمان بکە بەگیانو بەدڵ بۆ ئەو تێکۆشە
سۆران ، "لەوچەشمەی کە ئاو دەخۆیتەو گەر بەردی تێخەی ،نێو کەللەت بۆشە"

ح- مەبەستی قسەی پیشینیان ،بۆ وێنە : <u>هەویری مە (18)</u>

هەویری مەیان شێلا مەلایک ؟ دایان لەقالب بەکاتی شەوێ؟
سۆران مێشکی تۆ وا پاراو نیە " هەویری وەها ئاوی زۆر دەوێ"

خ- مەبستی ئامۆژگاری وڕەخنە بۆوێنە :

شارستانەتی (بڕێ لەهۆنراوەکەیە )

تەمەدون قەت دوروشمي ويسكيوقومار مەکە شارستانەت بەوتەی فۆکلوشەڵوار مەکە
بەم بەها نەجغەرەو وۆدکەو تریاک مەخۆ تەمەدون شتێ ترە ،ئیشی بەدئەتوارمەکە
تەمەدون تەکامولەکەلەفیکرا بێتەعەمەل قسەی سۆرانەدەلێ،چەوتی ئەفکارمەکە

تێبینی : ڕوناکە کە زۆرمەبەستی دیکەهەیە ، کەدەتوانێ بۆنووسینی هۆنراوەکەڵکی لێوەرگیرێ، کەبۆ بەرگری لە درێژبوونی ئەم باسە ، لێرەدا هەمویانم نەنووسیوە.

**٤- ڕێنووس و زاراوی هۆنراوە :**

وا باشە ، کەسێک کە هۆنراوەی کوردی دەنووسێ ، ئەمەی لەبیر بێ کە گشت کاتێ یەک چەشنە ڕێنووس و زاراو بەکاربێنێ ، کە ئەویش بریەتیە لە ڕێنووس و زاروی - " ستاندارد" ( یەکگرتوو ) .

بۆ ئەمەی کە هەلو مەرجێ بۆ وشەی یەکگرتوو دابنێین ، دەڵێم کە :

ا - ڕێنووسی یەکگرتووی زمانی کوردی ، تەقریبەن هەر ئەو ڕێنووسەیە ، کە گۆواری سروەی پێ دەنووسرێ .

ب - زاراوی یەکگرتووی زمانی سۆرانی کوردی تەقریبەن هەر ئەو زاراوەیە کە لە ناوچەی فەیزوڵڵابەگی بۆکان ، لە ئێران قسەی پێ دەکەن .

ڕووناکە کە بۆ نووسینی هۆنراوەی کۆمێدی و فۆلکلۆری ، دەتوانین لە زاراوەکانی تری زمانی کوردی کەڵک وەرگرین .

**٥ - وەزن :**

وەزن شتێکە ، کە بە هۆنراوە ئەهەنگ دەدا وهەر ئەمە ، هۆنراوە لە پەخشان جێـا دەکاتەوە . بۆ ئەوەی بزانن هۆنراوە وەزنی ڕێکوپێکی هەیە ، زۆر تر بە گوێرەی تەرازو ، لە گوێ کەڵک وەردەگرن . بەڵام من بۆ نووسینی هۆنراوەی کوردی ، فۆڕمولێک بەکار دەهێنم کە بەم چەشنەی خوارەوەیە : (١٩)

هەر وەک دەزانین ، هۆنراوە لە وشە پێکهاتوە و وشە لە " بەش" یا بەخش ، بـۆ وێنە :

مـافـی مرۆڤ

مـرۆڤـی جیهان هـەمـوو هـاوبـەشـن پـاکـی ئەندامی یـەک گیانـو لـەشـن
سـۆران جیاواز نین گشتی وەک یەکـن چ سـور ، چ سپی ، چ زەرد ، چ ڕەشـن

بـۆ نموونـە ، لـە هۆنراوەی سـەرەوەدا ، وشەی " جیهان " ، لە دوو بەشی "جێ" و" هـان" پێکهاتوە ، کە بەشی " جێ" بەشی کورتە وبەشی "هان" درێژە .

بۆ نیشان دانی بەشی " کورت " دوروشمی "." و بو نیشان دانی بەشی "درێژ" ، - دوروشمی "-" دادەنێین ، کە من پێی دەڵێم " خاڵ و خەت" . ئەگەر بمانەوێ ، خاڵ و خەت بە سازی تار لێ بدەین ، خاڵ " . " دەنگی "تە" و" خەت" دەنگی " تەن " دەدا . کـە بەم چەشنە دوروشمی وشەی "جیهان" دەبێتە ( . - ) و دەنگی بەسازی تار دەبێتە ( تە تەن ) .

بەم چەشنە ، ئەم هۆنراوەی خوارەوە ، دە کەوێتە نێو ئەم فۆڕمولە :

سەری سنگت دەڵێی باغی بەیانـە (٢٠) بـزەی لێوت وەکوو غـونچـەی بـەیـانـە (٢١) (بەیان)
بە شیری ڕووت قـەڵەم هـاتە گـرۆکاڵ (٢٢) (٢٣) وتەی من بۆیـە شاکاری بـەیـانـە (٢٤)

کە نێو دێری هەوەڵ بم جۆرەی لێ دێ:

سە ری سنـ گت دە ڵێی با غی بە یا نە ( بە هۆنراوە )
. - - - . - - - . - - - ( خاڵ و خەت )
تە تەن تەن تەن تە تەن تەن تەن تە تەن تەن تە ( دەنگی ساز )

هەر وەک چەشنی کارکردنی کامپیوتێر فەقەت بەعە دەدی یەک (١) و سیفر (٠) ە و

## چۆن هۆنراوە بنووسین؟

هیچ بەرنامەیەک، شتی تری غەیراز (١) و (٠) تێدانیە، تەواوی هۆنراوەی کوردیش لە بەشی کورت و درێژ پێک هاتوە و وەزنی هۆنراوە یانی ئەوەکە ئەو بەشە کورت ودرێژانە چۆن لای یەک قەرار بگرن.

١- ئەم بەشانە کورتن:[٢٥]

ا - پیتێکی بێ دەنگ، کە دوای ئەو پیتێکی دەنگ داری "ە" بێ وەک (دە).

ب- پیتێکی بێ دەنگ، کە دوای ئەو پیتێکی دەنگ داری "و"ی کورت بێ وەک(دو).

پ- پیتێکی بێ دەنگ، کە دوای ئەو پیتێکی دەنگ داری "ی"ی کورت بی وەک(دیـ).

ت- پیتی[٢٦] دەنگ داری "ە" ی تەنیا، وەک (ە).

ج - پیتی دەنگ داری "و" ی تەنیای درێژ، وەک (و).

چ - پیتی دەنگ داری "ی" ی تەنیای درێژ، وەک (ی).

ح - پیتی تەنیای بێ دەنگ، وەک (د).

٢- تەواوی بەشەکانی دیکە، هەمووی بەشی درێژن:

ا - دوپیتی بێ دەنگ بە یەکەوە، وەک (دڵ).

ب- پیتێکی دەنگ دار، لە نێوان دوو پیتی بێ دەنگ دا، وەک (دار).

پ- پیتێکی بێ دەنگ، کە دوای ئەو پیتێکی دەنگ داری "ا "بێ، وەک (دا).

ت- پیتێکی بێ دەنگ، کە دوای ئەو پیتێکی دەنگ داری "و"ی درێژ بێ، وەک (دوو).

ج - پیتێکی بێ دەنگ، کە دوای ئەو پیتێکی دەنگ داری "ی"ی درێژبێ، وەک (دی).

بۆئەمە کە باسە کە زۆر درێژ نەبێتەوە، لە نیشان دانی نموونەی تەواوی ئەو بەشانە لە هۆنراوەی کوردی دا، چاو پۆشی دەکەین. بەڵام خودی خوێنەرەکان خۆیان دەتوانن بەم فۆرمولە، هۆنراوە کوردیەکان بپێون یا ئەگەر بیانەوێ، نەزم بۆ هۆنراوەی خۆیان هەڵبژێرن.

دەتوانین بڵێین، کە ئەگەر باش لەم فۆرموولە تێبگەین، وەک ئاهەنگ سازێک دەتوانین، ئەهەنگ یا نەزمی هۆنراوەی خۆمان هەڵبژێرین یا بپێوین.

### ٦ - قافیە:

ئەو هۆنراوانە کە هۆنراوەی نوێ نین، دەبێ بێجگە لەمە کە وەزنیان هەیە، قافیەشیان ببێ. ڕووناکە کە هۆنراوەی نوێش دەتوانێ وەزن وقافیەی ببێ. بۆ نموونە، هۆنراوەی خوارەوە، هەم وەزنی هەیە و هەم قافیە:

هەستی هۆنەر (بڕێ لە هۆنراوەکەیە)

هەستی هۆنەر وا بە هەستە  دەڵێی دایم بە مەی مەستە
بەرجەوەندی سەردەمی ژین  پڕە بۆ ئەو لە قاقا و شین
مەسەل چاوی نەرمو بەڵەک  گەلاوێژی گەشی فەلەک
گۆو بەرۆکو دەستو بازن  کە مۆسیقای بزەو نازن
کاتێ وەسڵ دەبن لە چاو  وەک کارەبای قەوی و بە تاو
گلۆپی دڵ ڕووناك دەکەن  ئەو بێ غەشو زگماك دەکەن
تەکان دەدەن هەستو خەیاڵ  قەڵەم وادێتە گوروکاڵ
گا گەشەی دێ، گا هێ گرین  تاوێ کەنین، تاوێ ئەسرین
بۆیە سۆران لە هەر شوێنێ  بە پێنووسی دوڕ دەچێنێ

لە هۆنراوەی سەرەوە دا، ئەم وشانە قافیەن:

هەستە - مەستە . ژین - شین . بەڵەک - فەلەک . بازن - نازن - چاو - تاو . ڕووناک -

## چۆن هۆنراوە بنووسین ؟

- زگماک . خەیاڵ - کاڵ . گرین - ئەسرین - شوێنێ - چێنێ .

هەروەک لە سەرەوە دەردەکەوێ ، دەبێ هەر قافیەیەک ، بە لایەنی کەمەوە ، دوو - پیتی ئاخری وەک دوو پیتی ئاخری قافیەکەی دی بێ . ئەگەر لەهۆنراوەیەک دا - ڕەدیف و قافیە ببێ ، دەبێ ، قافیە حاڵەتی خۆی وەک سەرەوە، ڕابگرێ، بۆ نموونە :
ڕووناک دەکەن - زگماک دەکەن .

**٧ - چوارچێوە :**

هۆنراوە دەتوانێ چوارچێوەی جۆربەجۆری ببێ ، وەک :
- غەزەل .
- قەسیدە .
- ڕوباعی ( چوارینە ) .
- موخەمەس ( پێنج خشتەکی ) .

ڕووناکە کە چوارچێوەی دی زۆرە ، کە لێرە دا ئەم باسە بە درێژە دەکێشێ . دەبێ ئەمە بزانین بۆ هەر مەبەستێ ، چەشنە وەزنێک و چەشنە چوارچێوەیەک شیاوە و لێدەکاڵێتەوە ، بۆ نموونە ، بۆ هۆنراوەی ئەوینی چوارچێوەی غەزەل و بۆ مەبەستی فەلسەفی، چوارچێوەی چوارینە باشترە .

**٨ - هۆنراوەی باش کامەیە ؟**

هۆنراوەی باش دەبێ بە لای کەمەوە ، ئەم چلۆنایەتیانەی خوارەوەی ببێ :
- لە بارەی مەبەستەوە جوان بێ .
- بە ڕێنووسو زاراوی یەکگرتوو نوسرابێ .
- وەزنی شیاو و ڕێکی ببێ .
- قافیەی ڕێک و پێک بێ .
- چوار چێوەی لەباری بۆ هەڵبژێردرابێ .
- پەیامی بەنرخی تێدابێ .
- شتێکی تازە بێ و لاسایی کردنەوە نەبێ .
- لەگەڵ وتاری خەڵکی ئاپۆرە تۆفیری ببێ .
- ڕۆح لە نێوان وشەکانی دا ببێ .
- سەنعەتی ئەدەبی چاکی تێدا بێ وەک :
بەیان ، بەدیع ، کەلام ، جناس وشتی تر .

**٩ - پەیامی هۆنراوە :**

بێجگە لەوە کە دەبێ هونراوە جوان و ڕێک وپێک بێ ، دەبێ پەیام یا پەیام گەلی بە نرخیشی تێدابێ. هۆنراوەی بێ پەیام وەک لەشی بێرۆح وایە . تا پەیامی هۆنراوە - بەرزتر بێ ، ئەو هۆنراوەیە باشترە . نابێ فەقەت هۆنراوە بۆ جوانی بنووسین، جوانی هۆنراوە وەک جوانی مرۆڤە ، ئەگەر پەیامی بە نرخی تێدا نەبێ، وەک مرۆڤی جوانی بێکەماڵە و - کوتویانە : " کەماڵ لە زوور جەماڵەوەیە ، بەڵام کەماڵ و جەماڵ بە یەکەوە گەلێ بەنرخن" .

فەرهەنگۆکی ئەم نووسراوەیە لە لاپەڕەی ٢٧ دا نووسراوە .

سۆران ( حسن صلاح ) .

## فەرهەنگۆك

============

بۆ نووسراوەی " چۆن هونراوە بنووسین ؟"

(١) تەگبیر ـ مەشوەرەت .(٢) بیر ـ تەفەكور ـ (٣) بیر ـ تەفەكور. (۴) بیر ـ چاڵ (۵) تەک بیر ـ تكبیر. (۶) كاڵە ـ نەگەیوە. (٧) كاڵە ـ شینو كاڵە.(٨) قۆندرە ـ چەشنە كەوشێكە .(٩) كاڵە ـ چەشنە پێڵاوێكە . (١٠) بە تاوە ـ بە گورە. (١١) تاوە ـ تۆفانە. (١٢) تاوە ـ خۆرە (١٣) تاوە ـ تەبو تابە . (١۴) تاوە ـ رۆژە .(١۵) هەتاوە ـ خۆرە .(١۶) چەمەریانە ـ بەگریانەوە هەڵ دەپەڕن . (١٧) مێكووک ـ چەشنە كولێكە . (١٨) هەویری مە ـ هەویری ئێمە كە ئیشارەیەكە بۆ هۆنراوەی حافزی شیرازی ، كە دەڵێ " گل آدم بسرشتندو بەپیمانەزدند". (١٩) بەش ـ " بخش"ی فارسی . (٢٠) بەیان ـ بەهێیان . (٢١) بەیان ـ دەمبەیان .(٢٢) شیر ـ شمشێر ـ شیری خواردەمەنی . (٢٣) ڕووت ـ ڕوی تۆ ـ خالیس .(٢۴) بەیان ـ بەیانو كەلام. (٢۵) پیتی بێدەنگ ـ Consonant . (٢۶) پیتی دەنگدار ـ Vowel .

* * * * * * *

# وشەسازی

زانستی( وشە سازی) زانستێکە ، کە بە هۆی ئەو وشە دروست دەکرێ. لە تەواوی ـ زمانەکانی جیهاندا ، بۆ سازکردنی وشە کەڵک لە ئەم زانستە وەردەگرن . چون زانست و تێکنۆلۆژی لە تەواوی وڵاتەکاندا ، ڕۆژ بە ڕۆژ پەرەدەستێنێ، بە پێی ئەم ئاڵوگۆڕە، پێویست بە وشەی تازە هەیە. چون زۆر شتی وەها دێتەگۆڕێ، کە لە پێشدا نەبوە و وشەیەکی تایبەت بۆئەو نەبوە ، جا لەبەر ئەمە دەبێ وشەیەکی تازەی بۆدروست بکەن . بۆ نموونە، کاتێک کە لە وڵاتی خۆمان، بۆ جاری هەوەڵ ناوەندێک بە ناوی ( ئاکادێمی) هاتە دروست بوون ، گەران کە وشەیەکی بۆ ساز کەن ، چون ئەم وشەیە یۆنانیە . جا ، هاتن و وشەی ( فەرهەنگستان )یان ، لە جێگەی وشەی ( ئاکادێمی) دانا ، کە بە مانای جێگایەکە ،کە خەریکی لێکۆڵینەوەیە .

لە زمانی کوردیشدا ، کە یەکێک لە زمانەکانی جیهانە ، پێویست بە ئەم کارە هەیە بەڵام هەر وەک دەزانین ، لە تەواوی جیهاندا ، ئەم کارە ، واتە ( وشەسازی) ، بە هۆی یەک فەرهەنگستان ئەنجام دەدرێ، واتە تاقمێکی پسپۆری ناسراو ئەم کارە دەکەن . چون لە زمانی کوردیدا ، تا ئێستا وەها فەرهەنگستان و تاقمە پسپۆرێک پێک نەهاتوە ، لەبەر ئەمە ناتوانرێ بەو چەشنەی کە بۆ تەواوی زمانەکان کاری ( وشەسازی) ئەنجام دە درێ ، بۆ کوردیش ئەنجام بدرێ . لە لایەکی دیکەشەوە ، پێویستی زۆر بەم کارە هەیە . لەبەر ئەمە من ئەم نووسراوەم ساز کرد، تا بە گوێرەی ئولگویەک ، بۆ کاری ( وشە سازی) کەڵکی لێوەرگیررێ و بتوانین بە شێوەی فەردی ئەم کارە بە چەشنی زانستی ئەنجام بدەین .

لەم نووسراوەیەدا ، بۆ نموونە ١٠ وشەم بەگوێرەی ئولگو، بە هۆی زانستی (وشەسازی) دروستکردوە ، کە بکەوێتە بەر سەرنجی خاوەن بیروڕاکان و لەگەڵ ڕێک کردنەوەی هەڵەو کەمو کورتیەکانیدا ، بۆ خۆشیان دەست بکەن بە ساز کردنی وشەی کوردی پێوست . بەڵام، ـ ئەوەی کە شیاوی باسە ئەمەیە ، کە ئەم کارە دەبێ بە پێی زانستی(وشە سازی ) ئەنجام ـ بدرێ ، نەک هەر بەگۆترە . چون ئەگەر بە گۆترە و ڕەمەکی ئەم کارە بکەین ، دەبێتە ( وشە داتاشین )، کە دیارە لە بەین زانستی ( وشە سازی) و کاری ( وشەداتاشین) دا ، ـ تۆفیرێکی زۆر هەیە .

کەرەسەی پێوست بۆ زانستی وشە سازی، ئەم زانستانەی خوارەوەیە :

١ـ زانستی ( وشە ناسی) ، کە بە زمانی فەڕانسە پیی دەڵێن ( Etymologie ).

٢ـ زانستی (تەشکناسی) ، کەبە زمانی فەڕانسە پێی دەڵێن ( Morphologie ).

٣ـ وێژەی کلاسیکی کورد.

٤ـ وێژەی فۆلکلۆریکی کورد.

٥ ـ فەرهەنگناسی ( Lexicologie ).

جا ئێستا ، لە خوارەوە ، بە پێی ئەم زانستە ١٠ وشەی کوردی نوێ دروست دەکەین، کە لە زمانی کوردیدا زۆر پێویستن ، بەڵام تا ئێستا وشەیەک بۆ ئەم شتانە ، لە زمانی کوردیدا نەبوە و پتر لە وشەی زمانەکانیدی کەڵک وەرگیرراوە :

١ـ کەلاڵە ( چرک نویس ):

---

( کەلاڵە )بەئەمە دەڵێن ، کە کارێکی سەرەتایی لە سەر کارێکی سەرەکی ئەنجام بدرێ.

بۆ نموونە:

الف ـ دەڵێن ( کەلاڵەی مەڕمەڕەکەی داناوە ) واتە ئەو مەڕمەڕە ( هەڵمات )ە ، کە

## وشەسازی

قەرا وایە بیکوتێ ، بە چەشنی سەرەتایی کوتیویە ، بەڵام کاری وردە کوتی (دەقیق کاری ) ماوە .

ب ـ لە وێژەی فۆلکلۆریکی زمانی کوردیدا ، دەڵێ :

تازەی داناوە ( گەڵاڵەی ) مەمکی بۆ خۆی حەز دەکا نامداتێ دایکی .

واتە تازە چرک نویسی ( تەرحی)، مەمکی داناوە ، یانی لە سەردەمی چاردەساڵی دایە ، خۆی دەیەوێ شووم پێ بکا ، بەڵام دایکی ناهێڵێ .

د ـ ( گەڵاڵە )ی سەددەکەیان تازە دارشتبو. واتە تەرحی سەرەتایی سەدەکەیان تازە دارشتبو.

سەرچاوەکان : الف = فەرهەنگناسی . ب = وێژەی فۆلکلۆریکی کوردی .

٢ـ مێملْ ( حەریف ).

(مێملْ) بە کەسێک یا شتێک دەڵێن ، کە حەریفی کەس یا شتێکی دی بێ، بۆ نموونە :

الف ـ لە وێژەی فۆلکلۆریکی زمانی کوردیدا دەڵێن :

ورچی سەردار، گورگ لادەرە قاتڵی کەشکە ، (مێملی) کەرە

واتە، ورچی سەری دارە یا گورگی قەراغ شیوە ، قاتڵی تەواوی کەشکەو حەریفی ڕۆنی کەرەیە.

ب ـ لە وێژەی کلاسیکی کوردیدا دەڵێ :

گمتەو زۆرخۆرو ورگن ، ( مێملی) گۆشتو برنج

کەللەی پووکو بەتاڵە ، هەیکەلی پەروارە ژان

سەرچاوەکان :الف = وێژەی فۆلکۆری کورد. ب = وێژەی کلاسیکی کورد.

٣ـ دەنگناسی ( Phonetics ).

(دەنگناسی ) ، بە زانستێک دەڵێن کە بە هۆی ئەو، دەنگی پیتەکانی ئەلفوبێ دەناسن ، بۆ نموونە :

ـ ( دەنگناسی ) زمانی کوردی زانستێکی بەرینە. کە وشەکە ، لە دوو بەشی خوارەوە پێک هاتوە : ( دەنگ ) و (ناسی) ، کە دەنگ بە مانای (صدا ) یە و (ناسی) بەمانای(ناسین)ە ، کە واتە ئەم وشەیە ، بە مانای ئەمەیە ، کە دەنگەکانی پێدەناسین .

سەرچاوە : زانستی وشەناسی .

٤ ـ شەخەک ( ئانتێن ):

( شاخەک ) واتە شاخێکی چکۆلوکە، کە بە زمانی لاتین بەشاخی حەشەرات دەڵێن: بۆ نموونە ، ( وریا بە کە "شاخەک"ی ڕادیۆکە نەچێ بە چاوتدا ).

وشەی ( شاخەک ) لە دوو بەشی خوارەوە پێک هاتوە:

شاخ ـ کە بریەتیە لە شاخی گیانلە بەران .

ک ـ کە پیتی چکۆڵە کردنەوەیە .

بەو چەشنەی سەرەوە ، ( شاخەک ) دەبێتە شاخێکی چکۆڵە. کە لە زمانی لاتین یش دا ، ئەم وشەیە هەر بە ئەم مانایەیە و لە زانستی حەشەرە ناسیدا ، ( ئانتێن)، بەشاخی حەشەرەکان دەڵێن ، کە چکۆڵەیە و بە هۆی ئەو شت هەست دەکەن .

سەر چاوە: تەشکناسی ، وشەناسی ، فەرهەنگناسی .

٥ ـ گەڕۆک ( سە ییارە ).

( گەڕۆک ) بە ئەو ئەستێرانە دەڵێن ، کە بە دەوری ڕۆژدا ، دەسوورێن و جێگەیان لە ئاسماندا دە گەڕێ ، بۆ نموونە دەڵێن :
ئەستێرەی ناهید ئەستێرەیەکە ( گەڕۆک ) ە ، بەڵام ئەستێرەی گەلاوێژ گەڕۆک نییە .
وشەی ( گەڕۆک )، بەمانای ئەمەیە ، کە شتێکە دەگەڕێ . لە زمانی عەرەبیش دا ، پێی دەڵێن ( سیارە ) واتە بە دەوری خۆردا ، دەگەڕێ . ئەم وشەیە لە لقەکانی مەسدەری ( گەڕان )ە . وەک ( ڕۆیشتن ) دەبێتە ( ڕەوەک ) و (نەزایین) دەبێتە (نەزۆک )، وشەی (گەڕان) یش ، دەبێتە (گەڕۆک ).
سەرچاوەکان : وشەناسی ، تەشکناسی ، فەرهەنگناسی .

٦ ـ بەتاقەوەنان ( بایکانی )

(بەتاقەوەنان ) یانی دانانی کتێب یا پەڕوەندە یا دەفتەر لە جێگایەکی تایبەتدا یا هەڵگرتنی ئەوان ، بۆ نموونە دەڵێن :
ئەوەندە کتێبەکەم لا خۆشەویست بوو ، کە وەک قورئان ( نام بە تاقەوە ). یا دەڵێن : ئەسڵەن کتێبەکەی نەخوێندبووەوە، وەک قورئان نابوی بە تاقەوە، کە لەو دوو نموونەی سەرەوە دا ، ( بە تاقەوەنان) واتە بایگانی کردن .
سەرچاوەکان : وێژەی فۆلکلۆریکی کورد، فەرهەنگناسی ..

٧ ـ هێڵ (خط ).

(هێڵ) یانی خەتی زەوی یا هەر شتێکی دی . بۆ نموونە دەڵێن :
الف ـ (هێڵی) بە زەویەکەدا نەبردبو. واتە خەتی لە زەویەکە نەدابوو.
ب ـ (هێڵی) بە سەر ( هێڵیەوە) نەبوو. واتە خەتی بەسەر خەتیەوە نەبوو.
سەرچاوەکان : وێژەی فۆلکۆریکی کورد، فەرهەنگناسی .

٨ ـ سێکۆشێن ( موسەلەسات ).

(سێکۆشێن ) بە زانستێک دەڵێن کە بە هۆی ئەم زانستە ، بۆ پێوانو ژمارەکردن ، کەڵک لە (سێکۆشە) یا ( موسەلەس ) وەردەگرن . بۆ نموونە :
زانستی ( سێکۆشێن ) زۆر بەکەڵکە ، کە لە قوتابخانەی ناوەندیەوە دەست بە فێربوونی دەکەن. ئەم وشەیە لە سێ بەش پێکهاتوە. ( سێ ـ گۆش ـ ێن ) واتە (موسەلەسات).
وشەی ( سێکۆشێن ) وشەیەکە، کە بە لاسایی کردنەوەی وشەی ( موسەلەس ) لە زمانی عەرەبیدا یا وشەی ( Trigonometrie ) لە زمانی فەرانسەیی ، ساز کراوە. کە دوو وشەی لاوەکی سەرەوە هەردووکیان بە مانای زانستی ( سێکۆشەکانە ).
سەرچاوەکان : وشە ناسی ، تەشکناسی ، فەرهەنگناسی .

٩ ـ تەوژم ( ئێنێرژی ):

(تەوژم ) بە هێز وپێز دەڵێن ، بۆ نموونە :
الف ـ لەم هۆنراوەیەدا کوتراوە:
پڕ تەوژمی شەوقی ژینە ، دڵتەڕو چالاکە گەنج
سەرکەشو مەستو نەترسە ، بێغەشو بێباکە گەنج

ب ـ هێندە سارد بوو، کـە خۆر تەوژمی نە بوو.
سەرچاوەکان : الف = وێژەی کلاسیکی کورد. ب = وێژەی فۆلکلۆریکی کورد.

۱۰ـ زەویناسی ( زەمین شناسی)

( زەویناسی) بە زانستێک دەڵێن کە لە چلۆنایەتی و سوروشتی زەوی دەکۆڵێتەوە، بۆ نموونـە:

تۆفیری زانستی ( زەویناسی) لەگەڵ زانستی ( هەواناسی) دا ئەمەیە، کە زانستـــی ( زەویناسی) باسی چلۆنایەتیەکانی زەوی دەکا، بەڵام زانستی ( هەواناسی) باسی چلۆنایەتیەکانی هەوا دەکا.

ئەم وشەیە لەم دوو بەشەی خوارەوە پێک هاتوە:
- ( زەوی) کە بە مانای عەرزە.
- (ناسی ) کە بە مانای ناسینە.
واتە زانستێک کە عەرزی پێ دەناسرێ.
سەرچاوەکان : وشە ناسی ، فەرهەنگناسی.

ئێستا کە لە لاپەڕەکانی پێشودا ، ۱۰ نموونەی (وشەسازی)مان نیشان دا، دەمەوێ ئەمە ڕوون بکەمەوە، کەمەبەستی (وشە سازی) بـۆخۆی لە دوو نەوع پێک هاتوە:

الف ـ ئەو وشانەی کە تا ئێستا نەبوە و بۆ خۆمان بە پێی چوارچێوی دیاری کراو، لە سەر بناغە پەسەندکراوەکان ، دروستی دەکەین . نموونەکەلی ژمارە ۳،۸و ۱۰ ی سەرەوە لە ئەم تاقمە وشانەن.

ب ـ ئەو وشانەی کە تا ئێستا بوە، بەڵام بە چەشنی سیستێماتیک کەڵکی لێـــوەر ـ نەگیراوە یا ڕوون تر بڵێین ، بە چەشنی دێمی کەڵکی لێوەرگیرراوە ، کە ئێمە دەتوانیـــم بیانخەینە نێو قاڵبێکی تازەوە بۆ ئەو مەبەستە، کەخۆمان دەمانەوێ . بۆ نموونە ئەم کارە لە پێش دا، لە بارەی وشەی ( بەستێن)ەوە کراوە ، کە بە چەشنی ئاسایی و دێمی (بەستێن) ـ واتە قەراغی چۆم، بەڵام ئێستا لە زمانی یەکگرتوی کوردیدا لە جێگەی وشەی (زەمینە)ی فارسی کەڵکی لێوەردەگێررێ . نموونەکەلی ژمارە ۱،۲،۴،۵،۶،۷و ۹ ی سەرەوە لە ئەم تاقمە وشانەن.

ســۆران

بۆنووسینی ئەم نووسراوەیە ، لە ئەم کتێبانەی خوارەوە کەڵک وەرگیرراوە:

۱ـ Petit Larousse بەزمانی فەرانسە.
۲ـ هەوارگەی ئەدەب. بەشی تەشکناسی و وشە ناسی .
۳ـ فەرهەنگی خاڵ.
۴ـ Der Brockhaus بەزمانی ئاڵمانی.
۵ـ Roots & Stems بەزمانی ئینگلیسی.

هەروەک دەزانین ، ئەلفوبێی هەر زمانێک ، کەرەسەی بنەڕەتی بناغەی ئەو زمانەیەو ئەگەر زمان بە دیوارێک دابنێین ، پیتەکانی ئەلفوبێ دەبنە خشتی دیوارەکە. جا لەبەر ئەمە شارەزایی لەگەڵ پیتەکانی ئەلفوبێ زۆر گرنگە.

دیارە کاتێک بمانەوێ لە ئەلفوبێ بکۆڵینەوە ، دەبێ لە ڕوانگەی جۆربەجۆرەوە ئەم کارە بکەین ، چون ئەلفوبێ وەک زۆر شتی تر، وەک سکەیەک وایە، کە تەنیا ڕوویەکی نیە .

یەکێک لە ڕووە جۆربەجۆرەکانی سکەی ئەلفوبێ بریەتیە لە فۆڕمناسی.فۆڕمناسی زانستێکە، کە بە هۆی ئەم زانستە، فۆڕم یا شکڵی پیتەکان دەناسین .

ئێستا کە لەسەرەوە بۆمان دەرکەوت کە زانستی فۆڕمناسی چیە، بەپێی ئەم زانستە، سەبارەت بە پیتەکانی ئەلفوبێی کوردی باس دەکەین .

کاتێک کە لە زۆر کەسان دەپرسی بۆچی پیتگەلی (ث) ، (ذ)، (ص)، (ض)، (ط)و (ظ)یان لە ئەلفوبێی کوردی دەرهاویشتوە ؟" وەڵامیان ئەمەیە" کە چون ئەم پیتانە عەرەبین ، ئەو کارەمان کردوە" . ئیدی شایەد نەزانن کە لە بارەی زانستی فۆڕمناسیەوە، تەنیا ئەو شەش پیتەی سەرەوە عەرەبی‌نین، بەڵکە تەواوی پیتەکانی ئەلفوبێی کوردی عەرەبین، حەتتا پیتگەلی ( پ )، ( چ) ، ( ژ ) و ( گ ).

بۆ سەلماندنی ئەم مەسەلەیە پێویستە بڵێم ، کە لە ڕوانگەی زانستی فۆڕمناسیەوە، لە جیهاندا ئەلفوبێگەلی جۆربەجۆر هەن ، وەک :

١ ـ پەهلەوی . ٢ ـ عەرەبی . ٣ ـ عیبری ، ٤ ـ کوردی ئیزەدی . ٥ ـ لاتین . ٦ ـ یۆنانی.
٧ ـ چەند ئەلفوبێی جۆربەجۆری تریش .

بەڵام کاتێک پیتگەلی ئەلفوبێی کوردی لە ڕوانگەی فۆڕمناسیەوە بەراوەرد بکەین ، بۆمان دەر دەکەوێ ، کە تەواوی پیتگەلی ئەم کوردیە کە ئێمە لە ئێران پێی دەنووسین، عەرەبین ، بۆ نموونە :

١ـ پیتی ( پ ) ، لاسایی کردنەوە یەکی پیتی ( ب ) یە، کە دوو نوختەی زیادتر بۆ دانراوە.

٣ ـ پیتی ( چ ) ، لاسایی کردنەوەیەکی پیتی ( ج )ە ، کەدوو نوختەی زیادتر بۆ دانراوە.

٣ ـ پیتی ( ژ ) ، لاسایی کردنەوەیەکی پیتی ( ز ) یە، کە دوو نوختەی زیادتر بۆ دانراوە.

٤ ـ پیتی ( گ )، لاسایی کردنەوەیەکی پیتی ( ک ) ە ، کە یەک سەرکێشی زیادتر بۆ دانراوە .

٥ ـ تەواوی پیتگەلی تری ئەلفوبێی کوردی ئەوانەن کە لە زمانی عەرەبیشدا ، هەن ، کە زمانی فارسیش هەر کەڵک لەوانە وەردەگرێ .

پێویستە ئەمەش ڕوون بکەینەوە کە ئەم مەبەستە ، تەنیا لە زمانی کوردیدا نیە ، بەڵکە بۆ نموونە ئەم زمانانەی خوارەوە زۆرتری پیتەکانی ئەلفوبێیان، لە زمانی لاتین وەرگرتوە :

١ـ ئینگیزی . ٢ـ فەڕانسە . ٣ ـ ئاڵمانی . ٤ ـ ئیتالیایی . ٥ ـ پورتەقاڵی . ٦ ـ سوێدی . ٧ ـ نورویژی . ٨ ـ ئیسپانیایی . ٩ ـ فلامیش . ١٠ـ دانمارکی .١١ـ ڕۆمانی . ١٢ ـ مەجاڕی . ١٣ـ بۆلغاری . ١٤ـ تورکی عەنەدۆڵ ( ئاناتۆلی) ١٥ـ ڕووسی . ١٦ـ کوردی ـ (لە تورکیا ).

بەڵام لێرەدا پێویستە ڕوونی کەینەوە کە:

ئ ـ ئەمەی کە دەڵێن پیتگەلی ( ث ) ، ( ذ ) ، ( ص ) ، ( ض ) ، ( ط ) و ( ظ )، عەرەبین مەنزووریان ئەمەیە کە لە ڕوانگەی زانستی دەنگناسیەوە ( Phoneties ) ەوە، ـ عەرەبین ، چون دەربڕینی ( تەلەفوزی)، ئەمانە بە عەرەبی بە چەشنێکی تایبەتـــــە ، دەنا لە زمانی کوردی وفارسیدا ، ( ث ) و (ص ) وەک ( س ) تەلەفوز دەکرین ، ( ذ ) ، ( ض ) و ( ظ ) هەروەک ( ز ) دەدەبڕرێن و ( ط ) وەک ( ت ) دەخوێندرێتەوە .

ب ـ ئەمەی کەدەڵێن ( پ ) ، ( چ ) ، ( ژ ) و ( گ ) عەرەبی نین ، مەبەست لەوەیە ، کـــە لە ڕوانگەی دەنگناسیەوە عەرەبی نین ، واتە بە زمانی عەرەبی، ئەم پیتگەلە بـــــەم چەشنەی خوارەوە تەلەفوز دەکرێن :

( پ ) بە چەشنی ( ب ) ، ( چ ) بە چەشنی (ج) ، ( ژ ) بە چەشنی (ج) و ( گ ) بە چەشنـــی ( ک ) دەردەبڕرێ . دەنا لە ڕوانگەی فۆڕمناسیەوە ، ئەمانە هەموویان عەرەبین .

دەبێ ئەمەش بزانین ، کە تەنیا زمانی کوردی نیە ، کە بەئەلفوبێی عەرەبی دەنووسرێ، بەڵکە ئەم زمانانەی خوارەوەش هەر بە ئە لفوبێی عەرەبی دەنووسرێن :

(١) فارسی . (٢) ئۆردو . (٣) دەری . (٤) بلووچی . (٥) چەند زمانی تریش .

## ســەر چاوە کــان

١ ـ Der Brockhaus بەزمانی ئاڵمانی .

## کامیان دروسته ؟

### ١ ـ (هاواڵ) یا ( ئاواڵ ).

بەبیروڕای من ( هاواڵ) دروستە ، چون :
ـ پێشگری ( هاو) بە مانای شەریکە ، نەک پێشگری( ئاو). بەس ئەم وشەیە ، لە ئەسڵـــدا ( هاوحاڵ) بووە ، کە کورت بوەتەوە و بووە بە ( هاواڵ)، واتە ئەو کەسەی کە ( هاوحاڵە ).
بەڵگەی ئەدەبی : (هاوالان) خزمان گوێ ڕابدێرن بەم وسیەتانەم ،زەین بسپێرن .
بناغەی زانستی: وشەناسی زمانی کوردی( Etymology ).

### ٢ـ (باغ)یا (باخ).

بە بیروڕای من (باغ) دروستە ، چون :
ـ وشەی (باغ) لە ئەو وشانەیە ، کە لە بەین زمانی کوردی وفارسی دا ، هاوبەشن ، بە پێـــی یاسای تەشکناسی ( Morphology ) کوردی، لە وشە هاوبەشەکاندا ، پیتی (غ)ی وشەی فارسی لە زمانی کوردیدا ، هەر (غ)دەمێنێتەوە و نابێتە (خ)، وەک ( تیغە ) و ( غیرەت ).
بەڵگەی ئەدەبی : لە (باغان) ئاهو ناڵین دێ دەڵێن شای نێو گوڵان ڕۆیی
لە مەیخانان سەدای شین دێ ، دەڵێن پیری موغان ڕۆیی
بناغەی زانستی : تەشکناسی زمانی کوردی .

### ٣ـ (ڕێگە) یا ( ڕێگا ).

بە بیروڕای من ( ڕێگە ) دروستە ، چون :
ـ بە پێی یاسای وشە ناسی کوردی، وشەی ( ڕێگە ) ، دوو بەشە ، بەم چەشنەی خوارەوە :
الف ـ (ڕێ) ، واتە جێگەیەک ، کە پێی دا دەڕون.
ب ـ (گە) ، کەپاشگری دوروشمی ( جێگەیە ) ، وەک ( هەوارگە )، و ( ڕەپێلگە ).
بەپێی زانستی تەشکناسی، ئەو وشانەی کە لەگەڵ زمانی فارسیدا هاوبەشن ، کاتێ دێتە نێـــو زمانی کوردیەوە ، ( پاشگری) " گاە" ، دبێتە (گە) ، وەک ایستگاە( ئیزگە ) و درگاە(دەرگە )
بەڵگەی ئەدەبی : ئەی خالۆی ڕێبوار (ڕێگە ) نازانم ( ڕێگەم) نیشان دە دەردت لەگیانم.
بناغەی زانستی : وشە ناسی و تەشکناسی زمانی کوردی .

### ٤ ـ (پیاوێک ) یا ( پیاوێ)

بە بیرواری من ( پیاوێک ) دروستە ، چون:
ـ پاشگری( یک ) هەر هەمان (یەک )ە . ( پیاوێک ) واتە یەک پیاو، کە بە زمانی فـارســی دەڵێن ( مردی).
بەڵگەی ئەدەبی : لە پڕ کە دەرگە ژەنراو کراوە ( پیاوێک ) هاتە ژوور سڵاویان داوە.
بناغەی زانستی : وشە ناسی کوردی .

# عیرفان لەهۆنراوەی کوردیدا

هەروەک دەزانین گەلی کورد، بە درێژایی مێژو هۆگری خواناسی وعیرفان بوە ولە تەواوی قۆناغەکانی مێژوودا ، بیر و باوەڕی پتەوی خۆی، سەبارەت بە یەزدانی مەزن دەربڕیوە کە ئەم ڕاستەقینەیە لە هۆنراوەی هۆنەران و ئاسەوارەکانی دیکەی هونەرمەندانی کورددا ، وەبەر چاو دەکەوێ . کە من لە ئەم نووسراوەیەدا دەمەوێ فەقەت باسی عیرفان لە هۆنراوەدا بکەم .

هەر لە ئەم پەیوەندیەدا ، لە خوارەوە بە پێی چەرخەکان ، لە بابا تاهیری عۆریانەوە دەستی پێدەکەم و بۆ هەر چەرخێک ، کە نموونەیەکی هۆنراوەی عیرفانیم دەست کەوتبێ، کورتە نموونەیەک پێشکەش دەکەم و بە بێ ئەمەی کەلێکدانەوە یەکیان لەسەر بنووسم ، دەیانخەمە بەر چاوی خوێنەرە بەڕێزەکان ، تا بۆخۆیان بە پێی زەوقی خۆیان بەراوەردیان بکەن و ڕەوەندی ئالۆگۆری ئەم چەشنە هۆنراوەیە ، لە ڕوانگەگەلی جۆربە جۆرەوەلێکبدەنەوە .

نموونەی هۆنراوە عیرفانیەکان ، بە پێی چەرخ و زەمان :

١- <u>بابا تاهیری عۆریان ( چەرخی ٥ کۆچی) : شێوەی لوری</u>

خوشا ئانان کە هەر شامان تە وینەن    سوخەن واتە کەرەن ، واتە نشینەن
گەرەم دەسرەس نەبی ئایەم تە وینەم    بشەم ئانان بوینەم، کە تە وینەن

٢- <u>مەلا پەرێشانی دینەوەری ( چەرخی ٩ کۆچی): شێوەی گۆرانی</u>

وەسف بەندەگی بزان سە حەرفەن    حەرفی سە ، کەلام و نەحوی سەرفەن
ژ(واو)وەدوود ، وەفا بکەر زەبت    ژ(صاد) صەبر، صەفا بکەر زەبت
(ف) فەقر وفاقە ، فەنا وامحەل    خیرولکەلامی ما قەلون وەدەل

٣- <u>سەیدی هەورامی یەکەم ( چەرخی ١٠ کۆچی) : شێوە هەورامی :</u>

ئەز ئەورۆمۆن مەکانم بی وولاتم    سەر و پیری خوای گێرەن خەلاتم
بەرۆ دەرویش لوو سەیرۆ وەلاتو    نەنیشتو هیچ وولاتیۆنە، نەساتم

٤ - <u>مەلا مستەفا بێسارانی (چەرخی ١١ کۆچی): شێوەی ماچۆماچۆ</u>

ئێمەیچ پەروانەی شەمشناسانیم    پەڕو باڵ سوختەی دین خاسانیم
میللەت پاک دین، پە یغەمبەرانیم    نەک جە تایەفەی کەم نەزەرانیم
بنمانە جەمین ، نوور پاکتەن    ئەر تۆ پاکەنی، جەکێ باکتەن

٥ - <u>ئەحمەدی خانی( چەرخی ١٢ کۆچی): شێوەی بادینانی .</u>

وولّلا ژ سفیدی وسیاهی    وی قەسدو غەرەز تویی ئیلاهی
ئەمما بە مرکەبا قەبایح    ڕووڕەش کرنە گەلەک سەفایح
خەتتی تیە سەرنوشت ، سەرمەشق    سی سالە ، خەتتی خەتا،دەکت مەشق

٦ - <u>مەلا خدری ڕووباری کوردستانی ( چەرخی١٣ کۆچی)</u> شێوەی گۆرانی

ڕۆڵە بزانی ، ڕۆڵە بزانی    فەرزەن وە جەگشت ، مەبۆ بزانی
ئەسڵ و فەرع دین ، چەنی ئەرکانی    چەنی ئەحکامان ، پەی موسوڵمانی
مەبۆ بزانی ، هەریۆ پەنجەنی    ئەرچی پەنجەنی ، ئەمما گەنجەنی
ئەسڵ دینمان زاتەن وسیفات    مەبدەئو مەعاد، پەنجوم نبووات
فەرع دینمان نمانەو ڕۆچی    زەکات ، حەج ،غەزا ، بزانە تۆچی

**٧ ـ حاجی قادری کۆیی( چەرخی١٤ کۆچی): شێوەسۆرانی**

ئەی بێ نەزیرو هەمتا ، هەرتۆی کە بەرقەراری
بێ دارو بێ دیاری، بێدارو پایەداری

جەبباری بێ فوتوری، سوڵتانی بێ قوسوری
ڕەززاقی مارو مووری، ئاودێری دێمەکاری

پیرۆزەی تەختی گەردوون ،مەسنوعی نەقشی تۆیە
یاقوت و لەعلی ڕۆژە، ئەستێرەکان دەواری

جێ و مەکانی تۆیە، بێ جێ وبێ مەکانی
لەیل و نەهاری تۆیە، بێ لەیل وبێ نەهاری

هەر ئەمری تۆ مەدارە بۆ کاروباری عالەم
هەرچەندە بێ وزیرو بە سەدرو بێ موشاری

سەحرانەوەردی شەوقت ، خورشید وماهی تابان
دوو جاریەن شەوو ڕۆژ بێ مەحمەل وعەماری

مەعلوومە بۆچی (حاجی)مەدحت دەکا بە کوردی
تا کەس نەڵێ بە کوردی نەکراوە وەسفی باری

ئەوانەی سەرەوە نموونەیەکی کورتی هۆنراوەی عیرفانی کوردی بوون ، کە لە چەرخەکانی رابوردو و حاڵ دا ، بە هۆی هۆنەرانی کوردەوە نووسراون ، کە من کورتەیەکی ئەوانەم پێشکەش کرد.
لە لایەکی دیکەوە ، هەر وەک دەبینن ، نموونەی زۆرتری زاراوە کوردیەکانیان تێدایە ، تا خوێنەری بەرێز لە زاراوەگەلی جۆر بەجۆر، نموونەگەلی جۆربەجۆری لە بەرچاو ـ بێ . بەڵام لەخوارەوە ، هۆنراوەیەکی عیرفانی خۆمتان پێشکەش دەکەم بەناوی( دڵ وچاو) تا نموونەیەکی هۆنراوەی عیرفانی هاوچەرخیشتان لە بەردەست دا بێ، تا بە قەولی حاجی (نەڵێن...)

**دڵ وچاو**

دڵ دەمێکە ، زاری زارو زاریە (١) چاو چەمێکە، چۆمی چەشمەی جاریە (٢)
ئەو بەکەیلە، کوڵ دەرێژێو کوڵ دەدا (٣)
ئەم بە تاڵە، تاڵەکەی مرواریە (٤)
ئەو کە قەلبە، قاوی بیری قەڵب ئەنێ(٥)
ئەم کە عەینە، عەینەکی ساکاریە (٦)
ئەو کە ڕامە، خەو ببینێ ، ڕم دەکا (٧)
ئەم کە ڕوونە، ڕەوزەنەی بێداریە (٨)
ئەو زمانی زیکری زاتی بێزەمان ( ٩)
ئەم کەمانی تیرکەشی ڕزگاریە (١٠)
ئەو کە گەرمە، تینی عیشقو مەستیە (١١)
ئەم کەشەوقە، تیشکی نووری باریە (١٢)
من کە سۆرانم لەعەینی دڵ دەکەم (١٣)
شێعری وردم فەلسەفەی دڵداریە (١٤)

(١) دەمێکە= لەمێژە ـ زارێکە ـ سەردەمیکە.
زاری = دەمی ـ گریانی

زارو = دەمو ـ گریانو.
زاریە = گریانیەتیە.
واتە: لە مێژە دڵ بووە بە دەمی گریانو شیوەن (بەدڵ دەگریم).
دڵ دەمێکە کە لە عەینی گریانو شیوەن دایە.
(٢) ـ چەمێکە = چاوێکە ـ جۆمێکە.
چەشمە = سەرچاوە ـ سەرەوەی چاو.
واتە: چاو چاوێکە، کە چۆمی سەرچاوەی فرمێسکی ڕەوانە.
چاو چۆمێکە، کە شەتاوی سەرچاوەی فرمێسکە.
(٣) :
واتە: دڵ لە کەیلە ودەکوڵێو هەڵ دەقوڵێ.
(٤) بەتاڵە = تاڵی پێوەیە.
تاڵەکەی = ڕشتەکەی.
واتە: چاو کە تاڵی پێوەیە، تاڵەکەی مرواریە، یانی بە شوێن یەکدا، وەک تاڵ، فرمێسکی
چەشنی مرواری هەڵدەڕێژێ.
(٥) قەڵب ـ بێسوود.
واتە: دڵ کەبەزمانی عەرەبی، پێی دەڵێن "قەلب"، بیرو فیکری قەڵب و بێسوود ڕاودەنێ
و بەرگریان لێ دەکا.
(٦) عەین ـ چاو.
عەینەک ـ چاویلکە.
ساکاری ـ بێ ئالایشی.
واتە: چاو کە بە عەرەبی پێی دەڵێن "عەین"، چاویلکەیەکە بۆ ساکاری یە.
چاو کە بە عەرەبیپێیدەڵێن "عەین"، عەینی هادی یارێنوێن کار دەکا و کـــاری
ڕێنوێنیە.
(٧): واتە ـ دڵ کە ڕامە، کاتێ دەخەوێ ڕادەچەنێو ڕم دەکا، لە حاڵێکدا، کە ڕام ودەستە ـ
مۆیە. واتە لە شەو دا خەو لە چاوی ناکەوێ و هەر کە خەوی لێدەکەوێ ڕادەچەنێ.
(٨): واتە: چاو کە ڕۆشنە، دەلاقەی بەخەبەری و هۆشیاریە، واتە لە شەودا، چاو کێشک دەکێشێ
و بەخەبەرە.
(٩) دڵ زمانێکە کە وەسفی زاتی بێزەمان دەکا، واتە زیکری خوا دەکا.
(١٠) کەمانی = کەوانی ـ کە مانەوەی.
واتە: چاو کە بە کەوانی برۆ ئاراستە بوە، تیرکەشەکانی، کە برژۆلی بن، کەرەسەی ڕزگاری
و ئازادی قەلبن وکێشکی دەکێشن.
(١١) واتە: دڵ کە گەرمە دەلیلی ئەمەیە، کە تینی عیشقو مەستی گەرمی کردوە، واتە بە هۆی
تەوژمی عیشقو مەستی دڵ گەرمە، واتە هۆی دڵگەرمی تەوژمی عیشقو مەستیە.
(١٢) واتە: چاو کە شەوقی تێدایە و دەدرەوشێتەوە، دەلیلی ئەمەیە تیشکی ڕەحمەت و ئەوینی
خوای باریتەعالای، لە چاودایە. واتە شەوق و زەوقی خوای مەزنی تێدایە.
(١٣) عەین = چاو ـ عەینەن.
واتە: من کە سۆرانم وەک چاوی دڵ وام، یا من کە سۆرانم وەک دڵ وام.
(١٤) ورد ـ دەقیق • دڵداری ـ عیشق ـ محەبەت.
واتە: هۆنراوەی دەقیقم فەلسەفەی محبەت تەبلیغ دەکا.

حسن صلاح (سۆران)

## وتەی کورت

ـ تەواوی ئالوگۆڕەکان (تەحەوللات) وەک میوەوان ، بۆ گەیشتنیان پێویست بە زەمانە .
ـ سەرکەوتن بوشکولە ، دەنا هاتنەخوارەوە ئاسانە .
ـ زانیاری و هەستی مرۆڤ ، وەک ئاوێک وایە ، کە لە چەند لوولەوە دێتە دەرەوە ، کە ئەو لوولانە بریەتین لە پێنج هەستی ئەو مرۆوە یا ئەندامە کاراکانی لەشی ، ئەگەر یەکێک لەو لوولانە بگیرێ ، لە لوولەکانی ترەوە کە نەگیراون ، هەست و توانایی پتر سەر هەڵدەدەن .
ـ بیستن و دیتن بۆ سەلماندنی راستەقینە کافی نیە ، بەڵکە وا باشە لەمسی بکەی ، تا هەستی لامیسە ، هەڵە ئیحتیمالیەکانی گوێ وچاو کۆنترۆڵ بکا .
ـ کاتێ زگ برسی بوو ، تەرازوی ویجدان سەرسەنگ دەبێ .
ـ کوڕ داری بێبەرە ، کچ داری بەبەرە .
ـ زمانگەلی جۆربەجۆری جیهان زۆر تۆفیریان لەگەڵ یەکدا نیە ، چون هەموویان بە هۆی زمان ( زمانی نێو دەم) بەیان دەکرێن .
ـ هەر کەس لە قسەکردن دا دەنگی خۆی بەرز بکاتەوە ، دەیەوێ شتی غەیرە مەنتیقی بە زەبری گورەوهەرا لە مێشکی خەڵک ڕۆکا .
ـ بۆ سەلماندنی هەر درۆیەک ، دەبێ چەند درۆی تر بکەی .
ـقانیعترین مرۆو ، دەوڵەمەندترین مرۆوە .
ـ تا منداڵەکانتان چکۆڵەن ، لە سەر باوشتانیان دابنێن ، دەنا کاتێک زل بوون ، لێتان دووردەکەونەوە .
ـ گەورەترین نیعمەتی ژیان ، ئاسایشی ڕۆحە .
ـ هەتا دەتوانی لە خەوتن پارێز بکە ، چون لە پاش مەرگ ، کاتێکی زۆرت هەیە بۆ خەوتن .
ـ مۆسیقای چاک تۆزی ماندویی لە مێشک دەشۆرێتەوە .
ـ کاتی بیرکردنەوە ، بەنرخترین کاتە .
ـ ئەگەر ئەمرۆ کارێکی چاکت لەدەست دێ ، بیکە ، شایەد سبەینێ ئیدی لە دەستت نەیە .
ـ مرۆو وەک تەنافباز وایە ، ئەگەر لە سەر تەنافی ژیان بەلایەکدا خوار ببێتەوە ، مەجبورە خۆی بەو لاکەی تردا خوارکاتەوە ، تا تەعادول بەدەست بێ .
ـ نێو چاوانی هەر کەس ، ئاوێنە دڵیەتی .
ـ قسەی ڕاست وەک تیغی تیژ برایە .
کاتێک کە قسە دەکەی شتێک بڵێ ، کە خۆت بروات پێی بێ ، دەنا کەس نایسەلمێنێ .
ـ ڕاستی و دروستی هەر کەسێک ، گەورەترین قازانجی بۆ خودی ئەو کەسەیە .
ـ ماڵی بە نەزمی پیرێژنێک لە وڵاتی بێ نەزمی پادشایەک چاکترە .
ـ درۆ وەک سەراو وایە ، هەتا لێی نزیک دەبیتەوە ، پتر دەزانی کە درۆیە و ڕاستەقینە وەک کێو وایە ، تا پتر لێی نزیک دەبیتەوە ، پتر دەزانی ڕاستە .
ـ مرۆوپێنج هەستی هەیە ، کە وابێ وەک ڕادیویەک وایە کە پێنج شەپۆلی بێ ، هەر پەدیدەیەکی عالەمی خەلقەت ، کە لەسەر ئەو شەپۆلانە بێ ، بەو پێنج شەپۆلە دەیگرێ ، بەلام باوەکوو زۆر پەدیدەی تر هەیە ، ئەمما چون لەسەر ئەو پێنج شەپۆلە نین ، نایانگرێ ، جا چون نایانگرێ ، پێی وایە نین .
ـ کاتێ تۆفان دێ ، مومکینە داروگیا گەورە و گرنگەکان بشکێنێ ، چون مانیعن لە سەر ڕێگەی تۆفان دا ، بەڵام مومکینە ئەوانی چکۆڵە وناگرینگ نەختێک بژاکێنێ و لە دوای تۆفان

## وتەی کورت

کەم کەم بتوانن سەریان بەرزەوە کەن و لە نوێ ببوژێنەوە.

- نێو گرنگی بە مرۆو نابەخشێ، بەڵکە کردەوەی مرۆو لە درێژایی تەمەنی دا، گرنگی بە نێو دەبەخشێ.
- ژیان دوو بوعدیە، درێژاییەکەی توولی تەمەنە و گرنگیەکەی پانی تەمەن، توول ـ زەرب لە پانی دەبێتە سەتحی ڕووکاری ژیان.
- هەرچی بە بیری مرۆودا بێ، دەکرێ بە دەستی مرۆو دروستی بکەی، بەڵام دەبێ، ڕێگەی شیاو بۆ ئەو ئیشە بدۆزیتەوە.
- هەست کردنی درێژایی کات بە هۆی هەر گیانلەبەرێکەوە، پەیوەندیەکی نیسبی لەگەڵ زەلامی هەیکەلی ئەو گیانلەبەرە هەیە، هەتا هەیکەلی گەورە تر بێ، دەقایقی تەمەنی پێ کورت‌ترە و هەتا چکۆڵە تر بێ، دەقایقی تەمەنی پێ گەورەترە.
- گرنگی شەخسیەتی مرۆو بە دەولەمەندی، ڕەگەز یا پلەی زانیاری ئەو نیە، بەڵکە بە میزانی ئینسانیەتی (چاکی ئەخلاقی) ئەو کەسەیە.
- هەر مەبەستێک وەک قۆشەیەک (سککەیەک) وایە، کەچەند ڕوی هەیە.
- قەڵەم هێمنترین و کاراترین ئەسڵەحەی مرۆوە.
- ئەگەر بۆ هەر عەمەلێک، خیرا عەکسولعەمەلێکی شیاو نیشان بدەین، گرفتاری ژیانمان ناکەوێ بەسەر یەکدا.
- قسەکردن وەک خەرج کردن وایە، گوێ شل کردن وەک کاسبی کردن.
- قانوون هەیە و قانوون هەیە، ئەگەر دانەری قانوون گورگە، ئەو قانوونە بەکەڵکی مەر نایە، ئەگەر دانەری قانوون مەڕە بە کار گورگ نایە.
- مرۆو نە بۆ نۆکەری خولقاوە، نە بۆ ئاغایی، بەڵکە بۆ برایەتی خەلق بوە.
- لە هێندێک قوناغی ژیاندا هێندە ناهومێد دەبین، کەئیدی هیچ کارێک لە دەستمان نایە. لەو کاتەشدا باشترین پەنا خودایە.
- سەنعەت براترین چەکی هەر نەتەوەیەکە.
- هیچ سەربەستیەک، بێ سەربەستی ئابوری بەدەست‌نایە.
- تەواوی مرۆو بەنیادەمن، واتە لە نەتەوەی ئادەمن، کە وابێ گشتمان خزمین، خزمیش نابێ لەگەڵ یەکدا خراپ بێ.
- هونەر ئەوە نیە خەڵک بخەیتە نێو چاڵ، هونەر ئەوەیە خەڵک‌لە نێو چاڵ دەربهێنی.
- شەو ڕۆژی عارفانە.
- ڕیشەی توانین زانینە، میوەی زانین توانینە.
- ڕۆژ بۆ کوندەبو و شەمشەمەکوێرە و شتی وەها، شەوی تاریکە.
- ژیان بریەتیە لە برێک‌بیر و بروا و عادەت، کە مێشکی ئێمەی داگرتوە.
- ئەگەر گشت‌کاتێک لەبیرت بێ‌کە ژیانت بە موویەک بەندە:

کینەت نابێ، حەسوودی ناکەی، تووڕە نابی، تەماعت‌نابێ و خۆ بە گەورە نازانی.

- جەزای چاکە و خراپەی ئینسان بە ئیرس‌دەگا بە منداڵ، نەوە، نەتیجە و نەتەوی خوێ، جا ئەگەر وایە وەزیفەمان ئەمەیە کە چاکە بکەین و خراپە نەکەین، چون ئەگەر وا نەکەین، بێجگە لەمە کە خۆمان زیان وزەرەر دەکەین، توی دڕو بۆ منداڵ، نەوە، نەتیجە و نەتەوەمان دەچێنین. دیارە لە توی دڕو بەرهەمی دڕو بەدەست‌دێ.
- ئاشتی وەک گوڵ وایە، هەم جوانە وهەم بێنی خۆشە، شەڕ وەک دڕو وایە، کە هەر دڕک و داڵی هەیە، دیارە مرۆوی عاقڵ گوڵ هەڵدەبژێرێ و دڕو فڕێ دەدا.
- هەمیشە ئەم چەند خاڵەت لەبیربێ:

# وتەی کورت

بیری وا بکەرەوە ،کە عەمەلی بێ .
- هەر بایەکی هەڵخست ، خێرا دەست مەکە بەشەن کردن، چون شایەد باکە زوو بیگۆڕێ .
- یەکیەتی وەک عەمەلی جەمع وایە و نیفاق وەک تەفریق ، جەمع هێز زیاد دەکا و تەفریق هێز کەم دەکا .
- لەگەڵ یەکێک هاودەم بە ، کە شتێکی لێوە فێر بی .
- دڵ دەقیقترین کەرەسەی کۆنترۆڵی دڵی خەڵکی ترە .
- کاتێک شوغلێکی کرنگت بەدەستەوەیە یا پووڵ و سامانێکی زۆرت هەیە، دۆست و خزمی زۆرت لێ پەیدا دەبێ ، کە ئەمانە هیچیان بەڕاستیان نیە، ئەوانەی کە لە کاتی تەنگانەدا لەگەڵتن بەڕاستیانە.
- بۆ فەیلەسووف بوون پێویست نیە کە حەتمەن با سەواد بی، چون فەلسەفە وەک دەنگ خۆشی وایە، لە زات و وجودی ئینسان دایە ، قوتابخانەکەشی مەدرەسەی ژیانە، نەک زانستگە ( دانشگاه).
- غەریبی خراپیەکەی فەقەت ئەوە نیە کە خەڵک ناناسی و دوور لە وڵاتی خۆتی ، بەڵکە ئەوەیە کە لە گەڵ فەرهەنگی غەریبدا غەریبی.
- دوو وشەی " عیلم" و " فەن " ئەوەندە گەورەن ، کە کەم کەم خەریکن هەردووکیان یەک مانا بدەن .
- دوو وشەی " فەرهەنگی" و " ئەدەبی" هێندە لە یەک نزیکن ، کە جیا کردنەوەیان ئیشێکی هونەریە .
- ئیحتیات عادەتێکە ، کە قەت زەرەری لێ نابینی.
- ئەگەر تێفکرین کە تەواوی وجوودی ئێمە لە زەڕرە پێک هاتوە، کە هێندێکیان بە دەور هێندێکیان دا دەخولێنەوە و بروانین ، کە خودی زەوی زەڕرەیەکە بە دەور خۆر دا - دەسووڕێتەوە و خۆریش زەڕرەیەکە لە کەهکەشاندا دەخولێتەوە و کەهکەشانیش لە کەیهان دا ڕەژە دەڕوا و کەیهانیش نازانین .... لێمان مەعلووم دەبێ، کە ئەم ژیانەی وا - هێندە دڵمان پێوەی بەندە، لە سەر زەڕراتی بێ پایە بەندە.
- ڕوانینی چاو لەدوانی دەم پڕ مانا ترە.
- سادقانە ترین معامەلە ، سەودای دڵە.
- هەر قسەیەک لە سەر نەواری سووروشت زەبت دەکرێ و هەر کارێک بکەی دووربینی خەلقەت وێنەی لێ هەڵدەگرێ ، جا ئەگەر وایە دەبێ هەمیشە ئاگامان لە خۆمان بێ .
- سەرەتای هەر کارێک ، بیر کردنەوە لەو کارەیە، جا ئەگەر وایە ، دەبێ قەت بیر لە کاری خراپ نەکەینەوە.
- کەماڵ و جەماڵ هەردووکیان باشن ، بەڵام کەماڵ برا گەورەی جەماڵە .
- کەماڵ بێ جەماڵ جوانە، بەڵام جەماڵ بێ کەماڵ ناشیرینە .
- گەورەترین محەببەت ، محەببەتی دایکە .
- لە محەببەتی دایک و باوکمان چاک خەبەردار نین ، چون باوە ئادەم دایک و بابی نەبووە، بەڵام چون باوە ئادەم بۆخۆشی مندالی بوە، بۆ مندالمان محەببەتمان زۆرە .
- تۆفان لە کێوە بەرزەکان ڕوو دەدا ، بەڵام سێڵاوەکەی نزماییەکان خاپوور دەکا .
- چاکترین ئەخلاق ئەوەیە ، کە لە پاشملە بەخراپی باسی کەس نەکەین.
- هەمیشە بە تەرازوی عەداڵەت سەنگی داوەری هەڵسەنگینە .
- باشترین میراتی ئەوەیە ، کە مندالی چاکمان لەپاش بەجی بمێنێ.
- خەو خەوی پێش نیوە شەوە، خەوی پاش نیوەشەو نیوە خەوە.

## وتەی کورت

- دۆستی چاک وەک زێر وایە، قەت ڕەنگی ناگۆڕێ.
- ئیلهام شتێکە، کە پەردەی خەیاڵ دەلەرێنێتەوە.
- شێعر فرمێسکی ڕوحە، پەخشان عارەقی ڕۆح.
- کاتێک کە ئاو بە خوێن ناشۆررێتەوە، چۆن خوێن بە خوێن دەشوررێتەوە.
- هێندێک بە ڕواڵەت ئاو بە ئاوردا دەکەن، بەلام لە باتین دا ئاور دەنێنە ژێر ئاو.
- هەناسەی هەژار وەک بای سەرسەر وایە، بناغەی کاخی زۆرداری لە بنچینە دەردەهێنێ.
- ئەوە گرنگ نیە کە چی دەڵێی، گرنگ ئەوەیە کە چی دەکەی.
- فرمێسکی مەزلووم وەک سێلاو وایە، عەمارەتی زوڵم تێک دەدا.
- هەمووشتێک بەهەموو کەسێک مەڵێ.
- هەر بەردێک لە جێگەی خۆی بلەقێ، نە جێگەی خۆی دەگرێتەوە و نە سەنگینی جارانی دەمێنێ.
- ئەگەر بە قاقای بەرز پێ بکەنی، وەک ئەوە وایە، کەبەتەپڵی عەقڵ، دەهۆڵی جەهل لێ دەی، بەلام ئەگەر بزە لەسەر لێوت بێ، وەک ئەوە وایە کە دەم دەرکی خانوی دڵ بە هۆی گوڵدانی جوان برازێنێتەوە.
- تەسمیم گرتن لە دوو جێگەدا زۆر گرنگترە: لە سەر دووڕێیان و لە دەم بون بەستدا.
- قەویترین پەردە، پەردەی عادەتە، کە هیچ مەقەستێک نایبڕێ.
- جوانترین خەسڵەتی مرۆو عەشقە.
- ناشیرین ترین خەسڵەتی عیسان ڕقە.
- پیسی لەش بە ئاو و سابوون پاک دەبێتەوە، بەڵام پیسی ڕۆح پاک بوونەوەی زۆر موشکوڵە.
- هەتا دەتوانی پللەی ئاواتی مەعنەویت بەرزتر بکەرەوە، چون هەوەڵین خۆر لە نووچکەی کێوی بەرز هەڵدێ وئاخرین خۆر لەو ئاوا دەبێ.
- لە سێ کەس پارێز بکە:
  عیسانی ماددی، هاواڵی بێ وەفا و بنیادەمی درۆزن.
- هەوساری عەقڵ مەدە بەدەست دڵەوە، هەوساری دڵ بدە بە دەست عەقڵەوە.
- چاکترین دەرمان بۆ نەخۆشی ڕۆح، عیبادەتە.
- چاکترین سەرمایە، منداڵی ساڵحە.
- درێژترین خەو، خەوی مەرگە.
- بە چرای عیلم شەوەزەنگی جەهل و تاریکی ڕووناک کەرەوە.
- نزیکترین ریگە بۆ گەیشتن بە ئامانج ئەوەیە، کە بە سەر خەتتی ڕاستدا بڕۆی.
- مەحرەمترین دۆستی هەرکەس، خودی ئەو کەسەیە.
- پیری و گەنجی موتڵەق نین، نیسبین.
- ئەگەر ئەمەت لە پێش چاوبێ، کەتەواوی گیانلەبەران مافی ژیانیان هەیە، زوڵم و زۆر ناکەی.
- سەعی بکە خەڵک لە بیری خۆیان دا موجەسسەمەت بۆ دروست کەن، دەنا موجەسسەمەی مەیدانەکان، زۆر بەردەوام نین.
- میراتی مرۆو دوو شتە، ئاسار و منداڵ.
- ژیانی ئابووری وەک ئاشوایە، تا زۆرتر ئارد بهاڕێ، زۆرتر باراشی بۆ دەهێنن.
- ناشیرین ترین قسە، زەممی پاشملەی خەڵکە.
- ئەگەر ئەمە قەبوول بکەی، کە تۆ قەترەیەکی لە ئۆقیانووسی مرۆوایەتی، زۆر شتی دیکەت بۆ حەل دەبێ.

# وتەی کورت

ـ ئەگەر شتێکی پێش بینی نەکراو ڕوو نەدا ، هەر بەم چەشنە کەهێواش هێواش خولقایت و هاتیتە دونیاوە و گەورە بوی ، هەر بەم چەشنە ، وردە وردە چکۆلە دەبیتەوە ، لێت بێ خەبەر دەبن و وەک شەم دەکوژێیتەوە .
ـ توندترین سیرعەت ، سیرعەتی بیرە .
ـ محەببەت وەها ڕوونە وەک ئاوی کانی وایە ، ئەگەر دەستی لێ نەدەی ، نەیشێوینی و لێلی نەکەی ، قەت لێڵ نابێ .
ـ مەنتیقی ئەمڕۆکەی مرۆو بە دەستی پیاو نووسراوە ، هەر لەبەر ئەمە ، مەنتیقی ژن لەگەڵ ئەم مەنتیقە جیاوازە .
ـ هەر وەک نازانین بۆ هاتوینەتە ئەم دونیایە و لە کوێوە هاتوین ، هەر واش نازانین بۆچی لەم دونیایە دەڕوین ودەچینە کوێ ، لەبەر ئەمە ، بۆخۆمان نوختەی ئیبهامین .
ـ گەورەترین سوودی چاکە کردن ، بەو کەسە دەگا کەچاکە کە دەکا .
ـ بەدیهینان و بارهێنانی منداڵ فەقەت وەزیفەیەکە لە بەرانبەر کۆمەڵی مرۆوایەتی دا ، یانی باوکت و دایکت تۆیان بە کۆمەڵ تەحویل داوە ، تۆش ئەو قەرزەی ئەوان دەبێ بدەێیتەوە .
ـ کار تەمەنی مرۆو درێژ دەکا .
ـ تا سەبارەت بە موعەممای ژیانی مرۆوەوە پتربیر بکەیتەوە ، پتر بۆت دەردەکەوێ ، کە هیچ لە بارەی دا نازانی .
ـ دەبێ کەللەی سەرت بە قەت گۆی زەوی زل بێ ، تا بتوانی لە بارەی چلۆنایەتی کەیهان و عالەمی خەلقەتدا ، بیر بکەیتەوە .
ـ گەورەترین زیانی خراپە کردن ، بە خودی ئەو کەسە دەگا کە خراپە دەکا .
ـ مێشکی مرۆو وەک چەقۆ وایە و بیرکردنەوە چەشنی هەسانە ، تا بە مێشک بیر بکەیتەوە ، تیژ تر دەبێ .
ـ ئەگەر بتوانین بزانین کە لە پێشدا ، مریشک دروست بوە یا هێلکە ، دە توانین لە زۆر لە ڕازەکانی عالەمی خەلقەت سەر دەربهێنین .
ـ بۆ ئەوەی کە بۆمان دەرکەوێ کە زۆر کەم دەزانین ، کافیە کە ئەمە بڵێین کە حەتتا لە بارەی مێشکەوە کە وەسیلەی زانین و تەفەکورە ، هیچ شتێکی سەرەکی نازانین .
ـ هەمیشە پێت وایە تۆ غەم دەخۆی ، بەڵام ڕاستەکەی ئەمەیە کە غەم تۆ دەخوا .
ـ هێندێک لە خەڵک وەک سێبەر وان ، تا بە دوایاندا بڕۆی ، پێیان ناگەی ، بەڵام تا لێیان دورکەویتەوە ، بە شوێنتدا دێن .
ـ پللەی گەورەیی شەخسیەتی هەر کەس ، لە سەر بناغەی ئاواتە بەرزەکانی پێک دێ .
ـ بەوە مەنازە کە باوکت و دایکت کێ بوون ، بەمە بنازە کە منداڵەکانت کێن .
ـ عەقڵ فەرمانی ژیانە و ویجدان تورموزی عەقڵە
ـ قسەی درۆ مەکە ، چون کاتێک خۆت دەزانی درۆیە ، خەڵک چۆن نازانن .
ـ ئەگەر ژیان فەقەت لە پەیداکردنی پووڵ دا خولاسە بکەینەوە ، دەبێ بڵێین کە ژیان فاجیعەیەکی گەورەیە .
ـ زامی شمشێر ساڕێژ دەبێ ، بەڵام جێگەی زامی زمان ساڕێژ نابێ .
ـ زمان بۆ دەربڕینی قسە بەکار دەبەن ، بەڵام بۆ دەربڕینی هەست ، لە دەست ، سەر و چاو کەڵک وەردەگرن.
ـ هەر وەک بیستن وەک دیتن نیە ، دیتنیش وەک دەست لێدان نیە .
ـ ئەوانەی کە ئاور هەڵدەگیرسێنن ، لەگەڵ ئەوانەی کە ئاو بە ئاوردا دەکەن ، تۆفیریان ـ

## وتەی کورت

- مرۆوی گەورە وەک کێوی زۆر بەرز وایە، سەری ناباتە ژێر تەموومژی ژیان .
- محەببەت هەموو کینەیەک لەبەین دەبا .
- ئەگەر دڵت لەگەڵ خەڵک پاک بێ ، هەموو خۆشیان دەوێی.
- کاری چاک وەک گوڵ وایە، بەرهەمی میوەیە ، کاری خراپ وەک درو وایە، بەرهەمی دەردوئێشە .
- نەوە لەبەر ئەوە خۆشەویستە، کە عەزیەتدەری عەزیەتدری تۆیە .
- یەک نەفەر دەکرێ خەڵکێکی زۆر بەرێوەبەرێ، بەڵام یەک نەفەر ناکرێ دوو ڕەئیسی ببێ .
- لە مەزرای ژیان دا، توی چاکە بچێنە و کودی محەببەتی لێدە، تا دەنکە تویەکی چاکە ، یەکوهەزار ببرێ .
- وەک خۆر بەفر و سەهۆڵ لە نسار دەتاوێنێتەوە ، بزەی سەر لێویش، خەم و خەفەتی ژیان لەبەین دەبا .
- قسە وەک تیر وایە و دەم وەک کەوان ، ئەگەر تیرلە کەوان دەرچوو، ئیتر ناگەڕێتەوە .
- ئەم سێ شتە مایەی خۆشبەختیە:
 هاوسەری چاک ، هاوڵێی چاک و جیرانی چاک .
- منداڵ میوەی باغی ژیانە ، هەم چاسی تێدایە و هەم کرمۆڵ .
- هەر ترسێک مەرگێکە ، ئەو کەسەی نەترسە، نەمرە .
- ژیان خەتتێکە کە لە نوختەی لەدایک بوونەوە دەستی پێدەکا و لە نوختەی مەرگ دا، تەواو دەبێ . گرنگ ئەوە نیە کە ئەو خەتتە چەندێک درێژە ، گرنگ ئەوەیە کە کام خەتتە .
- مرۆڤ وەک ئەمە وایە کە لە سەر عەقرەبەی سانیە بژێری سەعات سوار بوبێ وبە توندی ڕۆیشتنی ئەو عەقرەبەیە بۆ لای مەرگ بچێ .
- عەقڵ وەک تەرازو وایە ، ئەگەر سەر نەکا، دەتوانی هەموو مەبەستێکی بە دیققەت پێ هەڵسەنگێنی .
- فرمێسک وەک باران وایە، تەپوتۆزی عاسمانی ژیان دادەشۆرێ و بەرچاو ڕۆشن دەکاتەوە .
- مەرگ بە نرخترین نیعمەتە ، چون لە پاش مردن بەشەر خەوی ئەبەدی لێدەکەوێ.
- بەهار بەهاری عاشقانە و پایز بەهاری عارفان .
- ڕێبازی ژیان نزمی و هەورازی هەیە ، هەر کاتێک بە کەڵێکدا سەرکەوتی ، لە پاش ئەوەی کە بە نووچکەی گەیشتی، سەرەو خوار دەبیتەوە ، واتە:
 پاکی سەرکەوت و داکەوتە.

حەسەن سەلاح ( سۆران )
۱۳۶۷

# ڕێوشوێنی لێکۆڵینەوە

( Research Formulation )

لە جیهانی ئەمڕۆ دا ، کە تەواوی زانستەکان ڕوو بە گەشەسەندن دەڕۆن، مەسەلەی لێکۆڵینەوە گرنگیەکی زۆرتری بەدەست هێناوە و زانایانی هاوچەرخ لە ڕۆژدا هەزاران - هەزار نووسراوە و وتاری لێکۆڵینەوە ، لە بەستێنە جۆربەجۆرەکانی زانستیدا دەنووسن و دەڵێن . لەبەر ئەمە پێویستە کە ڕێوشوێن ( ڕەوش ) ێک ، بۆ ئەم کارە پێک بێ . دیارە هەرکەس کە خەریکی لێکۆڵینەوەیە ، بە لەونێک ئەم کارە ئەنجام دەدا . هی وەها هەیە کە چوارچێوەیەکی تایبەتی بۆ ئەم ئەرکە دیاری کردوە و کاتی لێکۆڵینەوە ، لەم ڕێوشوێنە کەڵک وەردەگرێ . هێندی کەسێ واش هەن ، کە لە چوارچێوە یەکی دیاری کراودا کار ناکەن و بە چەشنی وەڵاشم ئەم ئیشە دەکەن.

من بۆ لێکۆڵینەوەی خۆم کەڵک لە ڕێوشوێنێکی دیاری کراو وەردەگرم، کەلێرەدا بە کورتی باسی دەکەم . مەبەستی من ئەوەیە کە ئەم ڕێوشوێنە بە چەشنی کورت بناسێنم، تا ئەو کەسانەی کە دیەیخوێندنەوە ، ئەگەر زانیان جێی کەڵکە ، سوودی لێوەرگرن و بە کاتی لێکۆڵینەوە کەڵکی لێوەرگرن . ڕوون تر بڵێم، ئەم ڕێوشوێنە بە گوێرەی فورمووڵێک بۆ لێکۆڵینەوە دەناسێنم ، تا سەرنجی لێکۆڵەران ڕاکێشێ و ئەگەر پێیان باش بوو ، ئەوانیش کەڵکی لێوەرگرن ، ئەگەر دیان کەمو کوڕی هەیە ، باشتری بکەن . بەڵام بە هەر حاڵ ، بە بیروڕای من ، بۆ لێکۆڵینەوە ڕێوشوێنێک پێویستە .

ئێستا کە لە سەرەوە باسێکی سەرەتاییم سەبارەت بە ڕێوشوێنی لێکۆڵینەوە کرد، دەمەوێ لە دوو قۆناغی خوارەوەدا ، درێژە بە ئەم باسە بدەم:

١- چوارچێوەی ڕێوشوێن ( فۆرمول ).

٢ - نموونەیەکی لێکۆڵینەوە بە پێی ڕێوشوێنی دیاری کراوی خاڵی (١).

## ١ - چوارچێوەی ڕێوشوێن :

ئەم ڕێوشوێنە بریەتیە لە سێ قۆناغی خوارەوە :

الف- شی کردنەوە ( Analysis ) .

ب - بەراورد کردن ( Evaluation ).

ج - جەمبەندی ( Integration ).

### الف- شی کردنەوە :

لەم بەشە لە ڕێوشوێنەکەدا ، فەقەت باسی چلۆنایەتی زاتی ئەو مەبەستە دەکەین ، کە لێی دەکۆڵینەوە . واتە چون ئەم بەشە ناوی بەشی شی کردنەوەیە ، و شی کردنەوە واتە " تەجزیە" ، لەبەر ئەمەبە گوێرەی یەک لابڕاتوار لە زاتی مەبەستەکە دەڕوانین ، واتە کارمان بەسەر ئەوەوە نیە کە بڵێین دەبوو چۆن بوایە یا دەبێ چۆن بێ ،بەڵکە تەنیا دەڵێین کە چۆنە.

### ب- بەراوردکردن :

لەم بەشە لە ڕێوشوێنەکەدا ، فەقەت چلۆنایەتی ئەو مەبەستە، کە لێی دەکۆڵینەوە لە گەڵ چلۆنایەتی مەبەستە هاوچەشنەکان ، بەروارد دەکەین . واتە لە ئەم بەشەدا کارمان بە سەر ئەوەوە نیە کە مەبەستە کە لە زاتی خۆی دا چۆنە یا دەبێ چۆن بێ ، بەڵکە فەقەت لەگەڵ مەبەستگەلی موشابیهی دی موقایەسەی دەکەین .

ج - جەمبەندی :

لەم بەشە لە ڕێوشوێنەکەدا ، بە لەبەر چاوگرتنی شی کردنەوەی خاڵی (الف) وبەراوردی خاڵی (ب )ی سەرەوە و بە لەبەرچاوگرتنی زانیاری و زانستی خۆمان لە مەبەستەکەدا ، بیروڕای خۆمان دەردەبڕین ، واتە جەمبەندی دەکەین و دەڵێین ، کە مەبەستەکە چۆن بێ باشە .

ئێستا بە کەڵک وەرگرتن لە ئەو ڕێوشوێنەی سەرەوە، لە مەبەستێک دەکۆڵینەوە . لێرەدا مەبەستی " دوروشمی ( ٧ ) ، لە ڕێنووسی زمانی کوردیدا " ، بە گوێرەی نموونە هەڵدەبژێرین و لێی دەکۆڵینەوە :

٢ - نموونەیەکی لێکۆڵینەوە بە پێی ڕێوشوێنی دیاری کراوی خاڵی (١):

دوروشمی(٧) لە ڕێنووسی کوردیدا:

الف - شی کردنەوە :

دوروشمی (٧) کە شتێکە وەک عەددەدی حەوتی کوردی یا پیتی "وی" ی لاتین ، لە زمانی کوردیدا ، بە گوێرەی سەرکێش یا ژێرکێش ( Accent ) ، کەلکی لێوەردەگیرێ . لە زمانی کوردیدا ، ئەم دوروشمە لە سەر پیتگەلی ( ر ) ، (ل) ، (و) و ( ی ) دادەنێن، تابە ئەم چەشنە ، لەبارەی دەنگەوە، ئاڵوگۆڕێکی تێدا بە دیبهێنێ .

بۆ دانانی ئەم دوروشمە لە سەر پیتەکان ، لە شێوەگەلی جۆربەجۆر کەڵک وەردەگرن، بۆ نموونە :

١- بە دەست دەینووسن .

٢ - بە مەکینەی نووسین عەددەدی ( ٧ ) ی لە سەر دادەنێن .

٣ - بە کەمپیوتێر ڕێکی دەخەن .

ب - بەراورد کردن :

مەسەلەی دانانی دوروشمی (٧) لە سەر پیتەکان ، شتێکە کە لە زۆر زمانی دیکەدا باوە ، بۆ نموونە لە زمانگەلی ئینگلیزی ، فەرانسە و ئاڵمانی دا ، ئەم کارە دەکەن و بە دانانی دوروشم لە سەر یا ژێر پیتەکاندا ، دەنگیان دەگۆڕن ، بەم چەشنەی خوارەوە :

١- لە زمانی ئینگلیزیدا ، ئەگەر ژێرکێشی ( ٤ ) لە ژێر پیتی ( C ) دانێن ،هەمیشە دەنگی (سی ) دەدا ، وەک وشەی ( Façade ) کە بە مانای ڕووکاری ساختمانە. بە دانانی ئەم دوروشمە لە ژێر پیتی ( C ) دا ، ئەم وشەیە بە ئەم جۆرە دەردەبڕێ (فاساد)، دیارە ئەگەر ئەو دوروشمە لە ژێریدا نەبوایە، ( فاکاد) دەردەبڕرا .

٢ - لە زمانی فەرانسەدا ، ئەگەر سەرکێشی ( ⁄ ) لە سەر پیتی( E ) دانێن، هەمیشە دەنگی ( ی ) دەدا ، وەک وشەی ( NATIONALITÉ ) کە بە مانای ( مِلیَت )ە . بە دانانی ئەم دوروشمە لە سەر پیتی ( E ) ، ئەم وشەیە بە ئەم جۆرە دەردەبڕێ ( ناسیۆنالیتێ )، دیارە ئەگەر ئەو دوروشمەی لە سەری نەبوایە ، ( ناسیۆنالیت ) دەردەبڕرا .

٣ - لە زمانی ئاڵمانیدا ، ئەگەر سەرکێشی( ¨ ) لە سەر پیتی ( U ) دانێن، هەمیشە دەنگی (ویو) دەدا ، وەک وشەی ( FRÜHLING ) کە بە مانای ( بەهار)ە . بە دانانی ئەم دوروشمە لە سەر پیتی ( U ) ، ئەم وشەیە بە ئەم جۆرە دەردەبڕێ ( فرویوهلینگ )، دیارە ئەگەر ئەو دوروشمەی لە سەری نەبوایە، ( فرووهلینگ ) دەردەبڕرا .

ج ـ جەمبەندی :

بە لەبەرچاوگرتنی ئەو باسە کورتەی سەرەوە، بە بیروڕای من ، بۆ ئەوەی کە جیاوازی دەنگی پیتەکان دیاربێ ، وا باشە کە ئەو جیاوازیە بە هۆی شتێک دیاری بکرێ. بەڵام بەم دەلیلانەی خوارەوە ، پێموایە کە لە باتی ئەوە کەئەم جیاوازیانە بە هۆی سەرکێش و ژێرکێش دەرخرێ ، باشتر بوو کە بە هۆی پیت دەرخرێ . واتە لە زمانی کوردیدا کە کەڵک لە ئەلفوبێی تەشکی عەرەبی وەردەگیرێ، لە زۆر لە پیتەکان کەڵک وەرنا گرین، وەک (ث) ،(ذ)،(ص)،(ض)، (ط) ،(ظ)، کە دەیانتوانی لە جێگەی دانانی دوروشم بۆ گۆڕینی دەنگی پیتێک ، لە یەکێ لەو پیتانەی سەرەوە کەڵک وەرگرن ، بۆ نموونە لە جێیدا نانی دورشمی(٧) لەسەر پیتی (ر) ، کەڵک لە پیتی (ذ) وەرگرن ، واتە پیتی (ذ)دەنگی (ڕ) ی بدایە . هەر وەک لە سەرەوە کوتم ، ئەم کارە بە لای کەمەوە ، ئەم کەڵکانەی خوارەوەی بوو:

١ـ لە هەدەرچونی کات لە دانانی دوروشمی(٧) بەرگری دەکرد.
٢ ـ لە کردنی زەللەو هەڵە بەرگری دەکرد.
٣ـ لە بارەی شکڵ و ڕێنووسەوە جوانتر بوو.
٤ـ دەمانتوانی بە چاپخانە و مەکینەی نووسینی ئاسایی، زمانی کوردی بنووسین و پێویست نەبو ئەوەندە بۆ دانانی دوروشمی (٧) کوێرەوەری زۆر بکێشین .
٥ ـ لە بارەی گشتیەوە هیچ ئیرادی نەبوو، چون زۆر نەتەوەی دی ئەم کارەیان کردوە، بۆ نموونە لە زمانی ڕووسیدا ، پیتی (P) لاتینیان بە گوێرەی پیتی (R) هەڵبژاردوە و پیتی (H) لاتین لە جیی (N).

بە لەبەر چاوگرتنی ئەو باسەی سەرەوە ، ڕووناکە کە لە ڕۆژی هەوەڵەوە وا باش ـ بوو، کە لە جێی سەرکێش و ژێر کێش ، پیتی تایبەت بە شێوەی سەرەوە هەڵبژێرن ، بەڵام ئەم کارەیان نەکردوە. بەڵام ئێستاش کارلەکار نەترازاوە ، بە بیروڕای من وا چاکە کە هەوڵێکی گشتی بۆ چارەسەر کردنی ئەم مەبەستە بدرێ .

سۆران ١٣٦٧/٣/٢١

## تەشکناسی ( Morphology ) کوردی

تەشکناسی یا شکڵناسی وشە ، زانستێکە کە لە بارەی ئاڵوگۆڕی مێژوویی تەشک ( شکل )ی وشەکان باس دەکا . زمانی کوردیش وەکو تەواوی زمانەکانی دی ، دەکەوێتە ناو چوارچێوەی ئەم زانستەوە .

چون لە زمانی کوردیدا ، یەکجارزۆر کەم لە سەر ئەم زانستە کار کراوە ، ئامانجی سەرەکی من ئەمەیە کە ئەم زانیاریە بە چەشنێکی زۆر کورت بە خوێنەران بناسێنم ولە سەر بنەڕەتی ئەم زانستە ، چەند نموونە لە وشەی کوردی شی بکەمەوە .

بۆ ناساندنی ئەم زانستە ، دەبێ بڵێم کە تەشکناسی بە زمانی فارسی دەبێتە شکڵناسی و بە زمانی فەرانسە پێی دەڵێن ( Morphologie ) ، کە ئەگەر ئەم وشەیە بە پێی زانستی وشەناسی ( Etymology ) شی بکەینەوە ، بە مانای فۆرمناسیە ، واتە زانیاری فۆرم یا شکڵی شتێک .

چون وشەی " تەشک " یەکێک لە وشە چاکنەناسراوەکانی زمانی کوردیە ، لە خوارەوە شەش خشتەکیەک ( موسەددس ) ، دەخەمە بەرچاو ، کە وشەی " تەشک "ی ، تێدایە و بە گوێرەی بەڵگەی وێژەیی دەیسەلمێنم ، کە تەشک بە مانای " شکل "ە .

ئافرەتێ قورسو خوێنشیرین نەبێ      دژی دڵڕەقیو ڕقو قین نەبێ<br>
"تەشکیٓ ڕاوێژی وەک هەنگوین نەبێ      بەڵگەی فەلسەفەی تیگەیین نەبێ<br>
ئافرەتی وەها کۆمەڵ لەنگ دەکا<br>
لە جێی شانازی ژینی نەنگ دەکا

ئێستا کە مانای ئەم زانستەمان زانی ، بەپێی ئەم زانیاریە ، تەشکناسی نموونەی چەند وشەی کوردی ، لە پەیوەندی لەگەڵ زمانی فارسیدا ، شی دەکەینەوە . دیارە دەبێ ئەمە بزانین کە تەشکناسی زمانی کوردی بەرجەوەندی جۆربەجۆری هەیە ، بەڵام چون نزدیکترین زمان بەزمانی کوردی زمانی فارسیە ، لەبەر ئەوە لێرەدا ئەم زمانەم لە پەیوەندی لەگەڵ زمانی کوردیدا لێکداوە .

### چەند نموونە لە تەشکناسی وشە کوردیەکان

١- ئەو وشانەی لەگەڵ زمانی فارسیدا ، لە یەک ڕیشەن ، بەڵام پیتی "ب"ی وشە فارسیە کە ، لە وشە کوردیەکەدا ، دەبێتە پیتی "و" . :

شب ـ شەو ـ لب ـ لێو . سیب ـ سێو . خواب ـ خەو . تبریز ـ تەورێز .

٢- ئەو وشانەی لەگەڵ زمانی فارسیدا ، لە یەک ڕیشەن، بەڵام پیتی "و" ی وشە فارسیەکە، لە وشە کوردیەکەدا ، دەبێتە پتی "ۆ" :

روز ـ ڕۆژ . بور ـ بۆر . بو ـ بۆ . دوغ ـ دۆ . تو ـ تۆ .

٣- ئەو وشانەی لەگەڵ زمانی فارسیدا ، لە یەک ڕیشەن ، بەڵام پیتی "ز" ی وشە فارسیەکە ، لە وشە کوردیەکەدا ، دەبێتە پیتی "ژ" :

نماز ـ نوێژ ـ زندگی ـ ژیان . زانو ـ ئەژنۆ . زن ـ ژن . زنگ ـ ژەنگ .

٤- ئەو وشانەی لەگەڵ زمانی فارسی دا ، لە یەک ڕیشەن ، بەڵام پیتی "م"ی وشە فارسەکە ، لە وشە کوردیەکەدا ، دەبێتە پیتی "و" :

نام ـ ناو . خام ـ خاو . دلم ـ داو . چشم ـ چاو . تمام ـ تەواو .

٥ ـ ئەو وشانەی لەگەڵ زمانی فارسی دا ، لە یەک ڕیشەن ، بەڵام پیتی "ی"ی وشە فارسیەکە ، لە وشە کوردیەکەدا ، دەبیتە "ێ" :

دیم ـ دێم . دیو ـ دێو . بیکس ـ بێکەس . بیزار ـ بێزار .

٦ ـ ئەو وشانەی لەگەڵ زمانی فارسی دا ، لە یەک ڕیشەن ، بەڵام پیتی "ل" ی وشە فارسیەکە ، لە وشە کوردیەکەدا ، دبێتە " ڵ" :
گل ـ گوڵ . دل ـ دڵ . بلا ـ بەڵا . پلو ـ پڵاو . سلام ـ سڵاو .

## سەرچـــاوەکـــان


١ـ Der Brockhaus بەزمانی ئالمانی .
٢ـ Petit Larousse بەزمانی فەڕانسە .


سۆران ١٣٦٧/٣/٢

## کامیاندروسته؟: (زمانناسیزمانی کوردی)

### ١- (دەبزۆوێنێ) یا (دەبزوێنێت)؟:

بە بیر و ڕای من ( دەبزوێنێ ) دروستە، چون :

- لە زمانی کوردیدا، سێهەم کەسی زەمانی حازری تەنیا ( سوم شخص مضارع مفرد )، بە پیتی (ی) دوایی دێ، نەک بە پیتی (ت).

بەڵگەی ئەدەبی:

دیسانەو چاوی سەحاری تەلی ئیلهام ( دەبزوێنێ )
بڵێسەی ئاگری عەشقم خوڕەی ئەشکم بەکوڵ دێنێ
بەڵام ئەمجارە ئەسرینم لەگەڵ قاقا بەتێکرا دێن
چون ئەمجارە بە تەنازی پەچەی لادا ودەمیدێنێ
تکەی عارەق لەسەرکوڵمی ڕەواقی تەلعەتی حوسنە
بەجارێ نرخی یاقوت و دوڕ و دوڕدانە دەشکێنێ

بناغەی زانستی : ڕێزمانی زمانی کوردی.

### ٢- (ئاسمان) یا ( عاسمان)؟:

بە بیرو ڕای من ( ئاسمان) دروستە، چون :

- ئەو وشانەی کە لە نێوان زمانی کوردی و عەرەبیدا هاوبەشن، لە وشە هاوبەشەکاندا، پیتی (ئ) نابێتە پیتی (ع) و هەر (ئ) دەمێنێتەوە، وەک وشەی ( ئادەم )، ( ئەمین ) و ( ئەهرام ).

بەڵگەی ئەدەبی :

ئەی مانگ من و تۆ هەردوو هاودەردین    هەردوو گرفتار بەک ئاهی سەردین
تۆ وێڵ و ڕەنگ زەرد بە(ئاسمان)ەوە    منیش دەربەدەر بە شارانەوە

بناغەی زانستی : زانستی تەشکناسی ( Morphology ) زمانی کوردی.

### ٣- (پێ) یا ( پا )؟:

بە بیر و ڕای من ( پێ) دروستە ، چون :

- ئەو وشانەی کە لە زمانی کوردی وفارسیدا هاوبەشن و لە دووپیت پێک هاتوون، ئەگەر پیتی ئاخری وشە کە لە زمانی فارسیدا ( ا ) بێ، لە زمانی کوردیدا، دەبێتە پیتی (ی)، وەک : جا (جێ).

بەڵگەی فۆلکلۆری :

پێم لێ نێ، پێم لێ مەنێ، پێم لێ نێ بووکە زێنێ
وەرە سەرمان هەڵگرین، بچینە وڵاتی گەرمێنێ

بناغەی زانستی : تەشکناسی زمانی کوردی .

### ٤- ( سەرۆک ) یا (سەرەک )؟:

بە بیرو ڕای من (سەرۆک ) دروستە، چون :

- (سەرۆک ) واتە پێشەوا و ڕێبەر . ئەم وشەیە بەروەزنی (وشەی گەڕۆک) و ( لەرزۆک)ە، کە لە دوو بەشی خوارەوە پێک هاتوە: بەشی (سەر ) کە ڕیشەی وشەکەیە و بە مانای( سەر یا سەرەوەیە) و بەشی (ۆک ) ، کەپاشگرە ( Suffix ) و ئامرازێکی فیعلیە. واتە کەسێک کە لە سەرەوەیە یا لە لای سەرەوە دادەنیشێ ، کە هەمان مانای وشەی ( ڕەئیس ) دەدا .

بەڵگەی ئەدەبی :

کەمانە کۆمەی کووڕی کەللەیە  بە سۆزەی تۆوە مەبەستم گەیی
(سەرۆکی) تیپی خاست دەناسم  لێم نەبان مەبە، من بۆ تۆ خاسم
هەڵوێستەکانت زووخ دەوێستێنن  هەروەک قەنارەی سەرچڵ دەخوێنن
هەستی سروەکەت دڵپشکوێنە  شنەی شەپۆلت مەینەت وەرێنە
دامەزرێنەری نۆت و مەقامی  سەرچاوەی پەردەو نیوپەردە و گامی

بناغەی زانستی : وشەناسی ( Etymology ) زمانی کوردی.

سۆران ( حەسەن سەلاح)

## سەنعەتی (جناس) لەهۆنراوەی کوردیدا

ئەدەبی کوردی وەک تەواوی ئەدەبی زمانەکانی تر، سەنعەتی جۆربەجۆری تێدا بەکاردەبرێ، کە یەکێک لە ئەو سەناعاتە بریەتیە لە بەکاربردنی دووشە، کە بە رواڵەت لە یەک بچن و لە مانادا جویّ بن، کە بە زمانی عەرەبی پێی دەڵێن( جناس ). ئەم سەنعەتە هەم لە بەستێنی هۆنراوە دا و هەم لە کەوشەنی[1] پەخشاندا بە کاردەهێنرێ.
ئێمە لێرەدا باسی سەنعەتی( جناس ) لە هۆنراوەدا دەکەین.

کەڵکەکانی بەکاربردنی سەنعەتی جناس لە هۆنراوەدا بەلای کەمەوە، ئەم خاڵانەی خوارەوەن :

١- قووڵ کردنی مانا.

٢- جوان کردنی ئەشکە(٢)

وشەی جناس چەند نەوعن[3]، کە لە خوارەوە بە کورتی باسیان دەکەین و بەڵگەیەکی ئەدەبیان بۆ ناودەبەین :

١- جناسی تەواو :

لە جناسی تەواودا، وشەکان بە تەواوی لە رواڵەتدا یەکن، بەڵام ماناکانیان تۆفیری هەیە :

بەڵگە :

ناڵی لەبی حەبیبە، هەم لیبە هەم (لەبیبە) لەبارو دڵفریبە، فەرمانبەری ( لەبیبە )

( ناڵی )

٢- جناسی خەتتی :

لە جناسی خەتتیدا، ئەگەر لە نوختەو حەوت چاوپۆشی بکەین، پیتەکان هاوچەشنن:

بەڵگە :

سەرم وەک کێوی قەندیلە، سەری تۆزو تەمو ( تارە )

تەواوی مەینەتی دنیا لە دەوری ئەوخڕ و(بارە)

٣ - جناسی پیتی :

لەجناسی پیتیدا، ئەگەر لە پیتە بزوێنەکان چاوپۆشی بکەین، باقی پیتەکان هاوچەشنن :

بەڵگە :

تا (گوڵ) نەوەریوە، تا لەشت نەبوە بە (گڵ)

وەک (گوڵ ) بە، دەمێ دەم بە بزەوپیاڵە بەدەست

( هەژار )

مەبەستێکی زۆر گرنگ، کەدەبێ روونی کەمەوە، ئەمەیە کە نووسینی هۆنراوە بە سەنعەتی جناسەوە، سوودێکی تایبەتی لەگەڵ پەیوەندی بە رەوان بوونی مرخی هۆنەرەوە هەیە. یانی ئەگەر هۆنەر هەوڵ بدا، هۆنراوەی جناس بنووسێ، چون کارێکی ئاسان وئاسایی نیە، دەبێ زۆر زەحمەت بە هۆنینەوەی شێعرەکانیەوە بکێشی، لەبەر ئەمە ئەم کارە بۆخۆی بۆی دەبێتە چەشنە تەمرینێک و لە نووسینی هۆنراوەی ئاساییدا دەستی زۆر رادێ و رەوانتر دەبێ.

ئێستا لە خوارەوە، چەند نموونە لە سەنعەتی جناس لە هۆنراوەدا، دەناسێنین:

١- هێمن :

## سەنعەتی (جناس) لەهۆنراوەی کوردیدا

تۆ گوتت : من عاشقی سەودا سەری (دینم) دەوێ

من گوتم : تاکو بە ئاواتت بگەی (دینم)دەوێ

**٢- برایم ئەفخەمی :**

سروەو سریوەو جریوەی (مەلان ) لەسەر منارەی لکان وەک ( مەلان)

زکری خوا دەکەن دەمێ ناسرەون سوپاسی لوتفی چلۆن دەکەن ون

**٣- مەلیکولکەلامی مەجدی:**

دوو زولفی‌چەشنی (لاولاوە)، لەسەر ڕوی قامەت ئالاوە

خەم‌و پێچی هەموو داوە، چ لەملاوە،چ(لەولاوە)

موژەی وەک نووکی (پەیکانە)، سەراسەر کاری(پێکانە)

دلی گشت‌خزم و بێگانەی ،بە ئەم پەیکانەپێکاوە

**٤- نـالی :**

هەرچەندە کە (ڕووتم)، بە خودا عاشقی ( ڕوتـــم)

بێ بەرگیە عیللەت، کە هەتیو مەیلی بەتاوە

هەر جۆکەو جۆبارێ کەوا سوور و سوێربـــێ

جێی جۆششی گریانی منە،(خوێنـــە ڕژاوە)

**٥ - حـەقیقـی :**

٧٧

مەخلوقی زاتی تۆیە عالەم درشت‌و ( وردی) زەڕراتی کاییناتێ، ئەللایە زیکرو (وردی)

**٦ - سەیفولقوضات :**

تا ڕوژ وەکوو شێت،ڕوو لەکێوان کا تۆزی غوسسەو غەم، هەستە بە(بادە)

تا بڵێن زوحاک ، مار لەسەر شانی تایەک لە زولفی،چین چینت (بادە)

**٧ - مەحوی :**

لە دەوری خەستەخانەی عەشقی ئەو سەوزەی کەوا (شینە)

لە سەر هەر خەستەیە، یا خوێندنی یاسینەیا(شینە)

**٨ - خالید حیسامی (هێدی):**

لە ئەستۆم هێند گرانە بـــاری ( تاوان) چەماون پشتم و ئەژنۆم لــــە ( تـــاوان )

**٩ - سالم ساحێبقران :**

هەموو ئەشعاری دووشینم، لە وەسفی لێوی نووشین بــوو

دەچەسپا لێو بەسەر یەکدا ،حەکایەت بەسکە شیرین بــوو

عبووری دل ، بە چینی زولفتە، بۆ ماچی ڕوخســـارت

قەلەندەر تێپەڕی(چین)بــوو،بەلام مەیلی بە ما (چین)بوو

**١٠ - مەولەوی تاوگوزی:**

هـانـا های ویـەرۆ ، هاناهـای ویــەرۆ خالۆکەم زمسان ، هاناهای ویـــەرۆ

وەهار هەوای (بەرد) جەسەرزەمین( بەرد) تۆمەی گوڵاڵان، وەجۆی ورد ئـــاوەرد

**١١- عومەر سوڵتانی (وەفا )**

نەهاتیم بـوو کوتت دێم و (نەهاتـــی) بە لەعنەت بی گەلێ سەختە (نەهاتی)

**١٢- سەید کامیل (ئاوات):**

بەرانبەر شەمعی ڕوی دڵداری من با پێت بڵێم چۆنە؟
کەسی عاشق، دەبێ پیاوانە وەک پەروانە سووتابێ
هەزارو دەربەدەر بۆ کۆیی دڵبەر، سەر دەبا (پێ) بێ
بە سەر با بێمە بەر دەرکی هەتاکو هێزی (پێ)مابێ

**١٣- سوارەی ئیلخانیزادە:**

نابمە ڕێبواری گەلی (هات)و (نەهات) چارەکەم ئەوا بەشکو (هات) و (نەهات)

**١٤ - حاجی قادری کۆیی:**

ئەی بێ نەزیرو هەمتا، هەر تۆی کە بەرقەراری
(بێدار) و بێدیاری، (بێدار)و پایداری

**١٥ - ئەحمەد موختار:**

باوەڕ مەکەن ببن بە عەرەب، کوردی شارەزور
بێ ترس دەڵێم، لەڕاستی دڕاوە کلاوەکەم
ئەی گیانەکەم بە چاوی ڕەشت سوێند ئەخوم کەمن
بۆ دیتنی(چاوی) تۆیە هەر (چاوە)، (چاو)ئەکەم

**١٦ - بێخود:**

ئاخۆ چ مەوسمێکە، کە سەحراو شاخ و داخ؟
زەنگارو زەردو سوورو سپی و(شین) دەکا؟
ئەی باغەوان مەزانە، کە زستان گەڕایەوە
موژدەم بەرێ کە بۆ چلە ئەم بەفرە(شین)دەکا

**١٧- پیرەمێرد:**

هەریەک بە ڕەنگی نیازی (پێتە)
بۆ نیازی خوی خاکی بەر (پێتە)
چنوور بۆ زوڵفت لوول وپەشێوە
وەنەوشە مل کەچ خاڵی لای لێوە

**١٨ - حەمدی ساحیبقران:**

خۆزگە ئەمزانی بە سەرما فەلەک بۆ ناز ئەکا
حیفزی ئادابی قەواعید بۆچ بەئەمری شاز ئەکا
ساقی کوێرە، کاسە پەل، بادە نەسیبی شێت و شەل
موتریبی نا(ساز)ە، تاری بەزمی عالەم(ساز)ئەکا

ئێستا لە خوارەوە، برێک لە هۆنراوەکانی خۆم، کە لە نووسینیاندا، سەنعەتی (جناس) بەکاربراون، دەناسێنم:

**بیر**

کاتێ بەتاڵە ڕاوێژو تەک بیر
تۆفیری نیە یەک (بیر) وسەد (بیر)
سۆران لە (بیر)ی گێژاوەی(بیر) دا
نەجاتت دەدا، پاپۆری تەک بیر

## تاو

شەپۆلی ژین وەکو هەوری بە (تاوە) دەمێ (تاوە) دەمێ تاریک و (تاوە)
دەمێ بۆرانە، ڕێبەندانە سۆران دەمێ (تاوە) هەمووی (تاو) و هە (تاوە)

## کەوای ئەوین

بڕۆی چەشنی (کەوانە)، چون (کەوانە) ڕەشی بسکی، (شەوانە)(۴) چون (شەوانە)
بزەی لێوی (کەلێوە)(۵)، چون (کەلێوە) موژەی تیری (دەبانە)، چون (دەبانە)
یەخەی سینگی (کەزێوە)(۶)، چون (کەزێوە) دڵم گیری (مەمانە)، چون (مەمانە)
قەدو بەژنی (ناما من)، بۆی (نەمام من) (تەپەی)(۷) قەلبم (کەژانە)(۸)، چون (کەژانە)(۹)
وتەو شێعری (کەلامە)، چون (کەلامە) بەدیعی ڕوی (بەیانە)، چون (بەیانە)
ئەوینی مە (کەوایە)، چون (کەوایە) لیباسی (تازەمانە)، (تازەمانە)

سۆران

(۱) کەوشەن ـ زمینە. (۲) تەشک ـ شکڵ وفۆرم. (۳) بەڵگە ـ مەدرەک. (۴) شەوانە ـ شەوەیە (۵) کەلێوە = سەرپڕە. (۶) کەزێوە ـ شەبەقی بەیانە. (۷) تەپە ـ کوتە ـ تەپۆلک. (۸) ـ کەژانە ـ کەنێشە. (۹) کەژانە ـ کێوانە.

## شێعری نوێ چیە؟

هەروەک دەزانین ، شێعری کوردی دوو نەوعن . نەوعێکیان پێی دەڵێن شێعری کلاسیک و نەوعێکی تریان پێی دەڵێن شێعری نوێ . شێعری کلاسیک ئەو نەوعە شێعرەن کە بە شێوەی کۆن و لە سەر کێش و قافیەی هۆنراوەی کۆنی فارسی و عەرەبی نووسرابێ، وەک ـ هۆنراوەکانی مەولەوی ، نالی و قانع ، کە لە خوارەوە نموونەی ئەو شێعرانە دەبینن:

خالۆ خاڵۆتەن ، کەم واتە خاڵۆ      خاڵۆ دەم وەبان خاڵانت ماڵو

(مەولەوی)

هەر جۆگەو جۆبارێ کەوا سوورو سوێربێ      جێی جۆشش گریانی منە خوێنەرژاوە

هەرچەندە کە ڕووتم ، بەخودا عاشقی ڕووتم      بێ بەرگیە عیلەتکە هەتیو مەیلی بەتاوە

(نالی)

لە تۆزی ئاشدا غەرقم ، لە تەوقی سەر هەتا ئەژنۆم
بەڵام چەند خۆشە ئەو تۆزەکە هەرخۆم ئامیرم بۆخۆم
نەترسی ئەمری مافەوق و نەمەحکوومی بەراتی تۆم
لەسایەی زحمەتی قاچو سەروشان و دەس وئەستۆم
لە بۆ کەس چاو لەبەر نیم و خەیاڵی ڕێی ڕیا ناکەم

(قانع)

بەڵام شێعری نوێ بەو چەشنە هۆنراوانە دەڵێن ، کە لە بارەی کێش وقافیەوە لەگەڵ شێعری کلاسیکدا تۆفیریان هەیە . لێرەدا مەبەستی من ئەوەیە کە لە بارەی شێعری نوێوە بدوێم و تۆفیری بەینی شێعری نوێ و ئەوشتانەی کە بە ناوی شێعری نوێ دەنووسرێن دەرخەم.

لە زمانی کوردیدا ،شێعری نوێ لە چەند دەهە لەمەو پێشەوە کەوتە سەرزاران و ـ دەتوانین بڵێین کە یەکێک لەو هۆنەرانە کە ئەم رچەیەی شکاند، گۆرانی نەمر بوو. لە ئەو کاتە بەدواوە ، هەر کاتێک لاوان ویستیان کە هۆنراوە بنووسن ، چون گەنج بوون ونەو ـ پەرداز، زۆرتر بە دوای نووسینی شێعری نوێدا ڕۆیشتن ، ئەگەرچی پتری ئەوان وردەوردە لەگەڵ بەرەو ژوور چوونی تەمەندا ، هەستیشیان پیربوو و کەوتنە سەر ڕێگەی نووسینی هۆنراوەی کلاسیک .

ئێستا لە خوارەوە چلۆنایەتی شێعری نوێ شی دەکەینەوە :

### ١ـ شێعری نوێ چیە ؟

بە بیروڕای من ، هەر هۆنراوەیەک کە تەواوی ئەم چلۆنایەتیانەی خوارەوەی ببێ شێعری نوێیە :

ئ ـ چەشنە کێشێکی ڕیتمیکی تایبەتی ببێ ، بەڵام وەزن و درێژایی بەشەکانی نیودێرەکان ( میسراعەکان) ، وەک یەک نەبێ×

ب ـ چەشنە قافیەیەکی ببێ، بەڵام نەکەوێتە نێو چوارچێوەی قافیەی شێعری کلاسیک . کەوابێ ، دەتوانین بڵێین ، کە شێعری نوێ بریەتیە لە ئیبتیکاراتێک ، کە هۆنەر لە نێو چوارچێوەی زانستی کێش و قافیەدا دەیکا . جا ئەگەر وابێ هەر شێعرێک کە بە بێ لەبەر چاوگرتنی ئەو دوو خاڵەی سەرەوە بنووسرێ ، شێعری نوێ نیە . دەتوانین بڵێین کە هۆنەری شێعری نوێ ، وەک ئاهەنگسازێکی بلیمەتوایە ، کە لە سەر پایەی زانستی کێش و قافیە، ئەهەنگی تایبەت بۆ هۆنراوەکانی دروست دەکا ، کە غەیری ئەو ئاهەنگەیە کە لە چوارچێوەی شێعری کلاسیکدا بەکار دەهێنرێ و لەباری ئەدەبیەوە شتێکی زۆر جوانە .

## ٢ ـ بۆچی دەبێ شێعری نوێ کێش و قافیەی ڕیتمیکی تایبەتی بێ؟

ئ ـ ئەگەر ڕیتمی نەبێ ، ئاهەنگی نیە و لە گوێ خۆش نایە.
ب ـ ئەگەر ئەهەنگی نەبێ ، باش لە زەین ( حافیزە ) دا زەبت ناکرێ .
پ ـ ئەگەر لە زەیندا زەبت نەکرێ ، لە ڕوانگەی حوزوری زەینەوە جاویدان نیە .
ت ـ ئەگەر جاویدان نەبێ ، دەبێتە شتێکی ڕەمەکی ، کە نە شێعرە نە پەخشانە .

ئێستا لە خوارەوە دوو نموونە شێعر دەناسێنم، کە یەکێکیان شێعری نوێیە و یەکێکیان بە ناو شێعری نوێیە، دەنا لە ڕاستە قینەدا نە شێعرە ونە پەخشان .

ئ ـ نموونەی شێعری نوێ ، کە شتێکی زۆر جوان و بەکەڵکە :

هەر چەن دەکەم ئەو خەیاڵەی پێی مەستم ... بۆم ناخرێتە ناو چوارچێوەی هەڵبەستم
لێکدانەوەی دەروون ، قسەی زمانم ... بۆچی وەها دوورن لەیەک نازانم

(گۆران)

لە نێو شەپۆلی غەما سەرنگوون بێ ئارام
بە کێوی سەختی ژیانا ، بەپێ ، بە چنگە ڕنێ
خەریکی هەڵمەتی سەرکەوتنە ، بگاتە سەرێ
لە پڕ نشێوی کولۆڵی بواری لێ دەتەنێ

( نووری شێخ ساڵح)

ب ـ نموونەی شێعرێک ، کە هێندێک کەس دەیانەوێ بە گوێرەی شێعری نوێ بە خەڵکی بناسێنن :

ئەمە ئاسمانە......، بەڵێ ـ شتی سوور،
پەر قرتەی دێ ؟،
کۆڵەکەکانیش وەک تەرم قیت......،
دەڵێن خەیاڵێکی قووڵە ـ ...
قووڵ ، قووڵ ، قووڵ !!

( ئەو چەند دێرەی سەرەوە نووسراوی هیچ کەس نیە ، بەڵکە خۆم لە ڕوی هێندێک ئولگوی ئەو چەشنە نووسراوانەوە ، ئیقتیباسم کردوە کە دڵنیام زۆر لە خوێنەران، ئەم نموونە نووسراوانەیان دیوە ).

لە پاشماوەی ئەم باسەدا ، لە خوای مەزن داوا دەکەم کە هۆنەرانی ئێمە کە شێعری نوێ دەنوسن سەرکەوتوو بن و گشت کاتێک بە شوێن ئەمەدا بڕۆن، کە شوێنەواری ـ وەک خاڵی(ئ) ی سەرەوە خەلق بکەن ، نەک بەم کاغەزگرانیە کات و تەوژمی خۆیان بۆ نووسینی شتی وەک نووسراوەی خاڵی (ب ) خەسار بکەن ، تا لە داهاتووشدا ،مەیدانی شێعری نوێی ئێمە ، شۆڕە سواری وەک گۆران ، نووری شێخ ساڵح و کاک شێرکۆ بێکەسی هەر لێ هەڵکەوێ .

سۆران
١٣٦٧/١١/٢٥

# ناوەرۆك


| مەبەست | لاپەڕە |
| --- | --- |
| وشەناسی کوردی | ١ |
| هەڵکەوتو | ٣ |
| دەنگناسی زمانی کوردی | ٨ |
| ڕێوشوێنی وەرگێڕان | ١١ |
| تۆف و بەند | ١٣ |
| هۆنراوەی سوروشتی لە زمانی کوردیدا | ١٥ |
| خوێندەنەوە و نووسینی کوردی | ١٨ |
| چۆن هۆنراوە بنووسین ؟ | ٢١ |
| وشەسازی | ٢٨ |
| ئەلفوبێی کوردی لە ڕوانگەی فۆرمناسیەوە | ٣٢ |
| کامیان دروستە ؟ (١) | ٣٤ |
| عیرفان لە هۆنراوەی کوردیدا | ٣٥ |
| وتەی کورت | ٣٨ |
| ڕێوشوێنی لێکۆڵینەوە | ٤٤ |
| تەشکناسی کوردی | ٤٧ |
| کامیان دروستە ؟ (٢) | ٤٩ |
| سەنعەتی جناس لە هۆنراوەی کوردیدا | ٥١ |
| شیعری نوێ چیە ؟ | ٥٥ |